

# گۆڤاری کۆمپیوتەر

ژمارە
٤
(ئەیلول)ی ٢٠٠٥

گۆڤارێکی مانگانەی تایبەتە بەبواری کۆمپیوتەرو ئینتەرنێت ـ وەزارەتی رۆشنبیری دەری دەکات

www.compmagz.com




- چۆنیەتی گەڕانەوەی فایلە سڕاوەکان .
- ١٠ خاڵی گرنگ بۆ ڕێگە گرتن لەڤایرۆس .

- چۆنیەتی بەستانی دوو کۆمپیوتەر لەسەر یەک هێلی ئینتەرنێت .
- ناسینی گەورەترین ماڵپەڕ لەبواری وەرگێڕان .



پاشکۆی گۆڤار : سی دی تایبەت بە گۆڤارەکە

هەولێر ـ ٢٠٠٥

# زانستی سەردەم و زەرورەتی فێربوونی



**سەرنووسەر**

وەکوو ئاشکرایە کە زانستی کۆمپیوتەر بۆتە زەرورەتێکی ژیانی ئەمڕۆمان و بۆتە بەشێکی ڕۆژانە لە ژیانمان بۆ بەڕیوەبردن و جێ بە جێ کردنی کارەکانمان یان بۆ بەسەر بردنی کاتێکی خۆش یان بۆ وەرگرتنی زانیاریەکی پێویست یان هەر کارێکی لەم چەشنە ئنجا لە ناو ئەم کۆمەڵگایەی ئیمەدا هێشتا خەڵکانێکی زۆر هەن شارەزاییان نیە لە بەکارهێنانی سیستەم و بەرنامەکانی کۆمپیوتەر و ئەنتەرنێت بۆیە حەز دەکەم تیشکێک بخەمە سەر چەند خاڵێک لە بوارەکانی ئەم ئامێرەی کە لەم سەردەمە وەکوو ئامێرێکی بە توانا دەتوانین سوودێکی زۆری لێ وەربگرین و زۆربەی کارە گرانەکانمان بە هۆی ئەو ئامێرە زیرەکەوە ئاسان بکەین، بۆ نموونە پزیشکان بۆ بواری پزیشکی دەتوانن بەکاری بێنن کە ئێستا چەندین پرۆگرامی پزیشکی هەیە لەسەر سیدی پزیشکان یان قوتابیانی کۆلێژی پزیشکی دەتوانن سوودیان لێ ببینن یان ئەنتەرنێت کە باشترین سەرچاوەیە بۆ مامۆستایان و بۆ قوتابیان کە دەتوانن ڕۆژانە بەشداری بکەن لە ئەنجامدانی گفت و گۆ لەگەڵ مامۆستا بیانیەکانی تری جیهان یان بیر و ڕا گۆڕینەوە لەسەر نەشتەرگەریەک یان چارەسەریەک بۆ کەسێک کە لێرەدا ناتوانری وەکوو پێویست چارەسەری بۆ بکرێت یان بۆ بوارەکانی تری دەرمانسازی یان ددان سازی یان هەر بوارێکی تری پزیشکی و بوارەکانی تری وەکوو بواری ئەندازیاری کە ئەندازیارانیش دەتوانن سوود لە چەندین پرۆگرامی ئەندازیاری وەربگرن یان لە ڕێگای ئەنتەرنێتەوە چەندین سایتی ئەندازیاری هەیە کە بەڕاستی زانیاری باش و بە سوود بڵاو دەکەنەوە یان بواری ڕۆژنامە گەری کە لەو بوارەشدا چەندین سەرچاوەی زانیاری باش هەیە بۆ سوود وەرگرتنی ڕۆژنامەوانان هەروەها لە بواری فێرکردنی باڵا کە ئێستا چەندین سایت و چەندین ژووری گفت و گۆ کردن هەیە لە ئەنتەرنێت بۆ ئەو مەبەستە کە قوتابیانی زانکۆکان بۆ ئەنجامدانی تاقیکردنەوە یان بۆ مەبەستی خویندن دەتوانن بەشداری تیدا بکەن یان بۆ زانینی ئەنجامی تاقیکردنەوەکان وەک ئەوەی ئەمساڵ لە شاری هەولێر بینیمان کە ئەنجامی تاقیکردنەوەکان لە ڕێگای ئەنتەرنێتەوە بە هاوڵاتیان ڕاگەیندرا یان بۆ فێربوونی زمانە بیانیەکان وەکوو زمانی ئنگلیزی یان زمانی فەرەنسی یان زمانەکانی تری جیهانی یان بۆ ئەو کەسانەی کە لە ماڵەوەن دەتوانن ڕۆژانە لە ماڵەوە ئەو پێداویستیانەی کە هەیانە بە هۆی ئەنتەرنێتەوە جێ بە جێی بکەن وەکوو کڕینی شت و مەک و ناردن و وەرگرتنی پۆست و چەندینی شتی تری وەکوو کات بە سەر بردن لە کاتی دەست بەتاڵیدا یان هەر بوارێکی تر کە لەم جیهانەدا هەیە بەڕاستی کۆمپیوتەر و ئەنتەرنێت هۆیەکە بۆ ئاسان کردنی کاری هەموو تاکێکی ئەم جیهانە و لەسەر هەموو تاکێکی ئەم جیهانەش پێویستە کە خۆی فێری بەکارهێنانی کۆمپیوتەر و ئەنتەرنێت بکات بۆ ئەوەی لە پێشکەوتنەکانی جیهاندا بێ بەش و بێ ئاگا نەبێت.

ئمارە ( 4 )
ئەیلول 2005


# گۆڤاری کۆمپیوتەر


گۆڤارێکی مانگانەی تایبەتە بە بواری کۆمپیوتەر و ئەنتەرنێت . وەزارەتی ڕۆشنبیری دەری دەکات



**خاوەنی ئیمتیاز**
وەزیری ڕۆشنبیری
سامی شۆڕش

**سەرنووسەر**
ئاراز مەولود ڕەشید

**جێگری سەرنووسەر**
فاخر مەحمود میرزا

**بەڕێوبەری هونەری**
یاسین عاصم

**دەستەی نووسەران**
ڕێناز ئەردەلان بەکر
کاوە سلیمان
شاخەوان عمر حەسەن

**دیزاینی بەرگ**
عەزیز ئەسعەد

سەرپەرشتی چاپ
نهرو محمود
چاپخانەی پەروەردە


## تێبینی : هەموو پەیوەندیەکان لە ڕێگای سەرنووسەرەوە دەبێت


ناونیشان :
هەرێمی کوردستانی عێراق / هەولێر . دیوانی وەزارەتی ڕۆشنبیری . شەقامی شەست مەتری نزیك هۆلی زەرد
بۆ هەر پێشنیار و تێبینی و سەرنجێك یان ناردنی بابەتێك . پەیوەندی بکەن بە سەرنووسەرەوە بەم ناونیشانە : دیوانی وەزارەتی ڕۆشنبیری . بەڕیوبەرایەتی کۆمپیوتەر . یان بە ژمارە تەلەفۆنی 2232721 مۆبایل 07504618045 یان پۆستی ئەلکترۆنی



Email : computer_magazine_2005@yahoo.com

Email : aras_co_center@yahoo.com





**ئاگاداری**

بۆ هەموو ئەو بەڕێزانەی کە بابەت ئەنێرن بۆبڵاو کردنەوە لە گۆڤارەکەمان با بە تەواوی ئاماژە بکەن بە ناونیشان و سەرچاوەی ئەو بابەتەی کە دەینێرن بە پێچەوانەوە ئێمە بەرپرسیار نین لە هیچ لێپرسینەوەیەك.






AMER ALI (719).JPG @ 66.7% (RGB)











# بەرنامەی PcAnywere بۆ پێک بەستن بە کۆمپیوتەرێکی تر لە ڕێگەی هێلی تەلەفۆن

ئامادەکردنی: ئەژی عزیز

لە کۆمپیوتەرەکەت دا بەهۆی بەرنامەی PCANYWERE دەتوانیت پەیوەندی بە کۆمپیوتەرێکی تر لە مالێک یان لە سەنتەرێکی تر بکەیت لە ڕێگای هێلی تەلەفۆنەوە، هەروەها دەتوانین زانیاری و داتا بۆ کۆمپیوتەرێکی تر بگوازینەوە یان بە پێچەوانەوە، ئەمەش دەبێت هێلی تەلەفۆنەکە بە مۆدیۆم بەسترابێت، وە ئەم بەرنامەیە لە ڕێگای ژمارەی تەلەفۆنەکەی دەتوانین لە دوورەوە کۆنترۆلی کۆمپیوتەرەکی تر بکەین ئەویش چ کوژاندنەوەی بێ یان فۆرمات کردن یان شاشەی کۆمپیوتەرەکەی تر دێتە پێشت.




وێنەی ژمارە (١)

لەناو ئەم بەرنامەیەدا دەتوانیت ئینتەرنێت بەکاربهێنیت ئیمەیلی خۆت لە ناو بکەیتەوە.

ئەم بەرنامەیە کۆمپانیای SYMANTEC بە تایبەتی دروستی کردووە بۆ هەندێک حالەتی پێویست، بۆ نمونە یەکێک بەرێوەبەری دەزگایکە تەکنیکی یە لە ڕێگای کۆمپیوتەرەوە دەست بەسەر هەموو کومپیوتەری فەرمانبەرەکان دابگرێت یان هەر هەڵەیەک هەبێت چاکی بکاتەوە، یان کاتێک یەکێک دەچێتە سەفەرکردن لەوێ پێوستی بە زانیاریەک دەبێت لەناو کومپیوتەرەکەی لە ماڵەوە دا هەیە دەتوانێت بە هۆی ئەم بەرنامەیە دەستی بکەوێت.

ئەم بەرنامەیە دەتوانین لە ڕێگەی ئینتەرنێت دابەزێنین یان لە ناو ئینتەرنێت بیکینەوە بڕوانە وێنەی ژمارە (٢)




وێنەی ژمارە (٢)


وێنەی ژمارە (١)

# چەند جێبەجێکاریەکی ژمێریاری لە مایکرۆسۆف ئەکسلدا

ئا: دڵبەند ئیبراهیم

مایکرۆسۆفت ئەکسڵ بەرنامەیەکە زیاتر لە بواری کارو حسابات و بەڕێوەبردن و ئامارو شیکاری شیتەل کردن بەکار دەهێنرێت، ئەم بەرنامەیە زۆر ئاسانکاری ئامارو کردارە ژمێریاری تیدایە ئەمەش وایکردوە زۆرترین بەکار هێنەری هەبێت لە هەموو جیهاندا، کرداری کۆکودنەوەو لێدەرەکردن و لێکدان و دابەشکردن زۆر بەئاسانی تێیدا جێبەجی دەکرێت و وە دوای ئەم کردارەش خۆکاری هەموو ئەم کردارانە جێبەجێدەکاتەوە، واتا دوای دروست کردنی هاوکێشەکان و نەخشەکان، ئیتر بۆ هەموو جارێک ئەم دروست کردنە پێویست نیە خۆی کردارەکان جێبەجی دەکات وە لە یەک کاتدا جا بە خێرایەکی زۆر دەتوانێت هەرچوار کردرەکە بەیەکەوە ئەنجام بگەیەنێت واتە ئەگەر هاوکێشەکە هەرچوار کردارەکەی تێدابوو ئەوا دەتوانێت شیکاری بۆ بکات . ئەم جێبەجێکاریانە لە ئۆفیسی 97، 2000، XP، 2003 وەکو یەکن، بەشێوەیەکی گشتی فایلی ئەکسل پێک دێت لە BOOK کە ئەمیش سێ SHEET هەیە هەموو شیتێک لە (٦٥٥٣٦) ریز (ROW)، (٢٥٦) ستون (COLUMN) پێک هاتوە، هەموو ستونێک (٦٥٥٣٦) خانەی هەیە، وەهەموو ریزێک (٢٥٦) خانەی هەیە، واتە کۆی گشتی خانەکان لە (١٦٧٧٧٢١٦) . ریزەکان ناونراوەن بە ژمارە بیرکاریەکان لە (١، ٢، ٣ ...) ستونەکانیش ناونراون بە پیتی لاتینی لە (A.B.C.......)، هەریەک لەم خانانە کە ژمارەیان یەکجار زۆرە دەتوانرێت کرداری بیرکاری و ئامارو ژمێریاری تێدا بەجێ بکرێت بەبێ ئەوەی

وێنەی ژمارە (٢)

تێک بچن و کار لەیەک بکەن. واتە ئەتوانیت زیاتر لە نەخشەیەک لەناو یەک شیت دابنێیت و کارگەریان لەسەر یەک نەبێت وەهەموشیان بەیەکەوە ببەسترینەوە . بۆ ڕونکردنەوە بڕوانە وێنەی ژمارە (۱) بۆ نمونە گەنجینەیەکی شەکر ئەم نەخشەی دارشتوە، بۆ ئەوەی ڕۆژانە ئەو شەکرەی دەفرۆشێت دەبێت نەخشەیەک دابنێین خۆکارانە کرداری کۆکردنەوە بکات، ئەمەش ئاسانەو لەسەرەتادا هەموو ئەوخانانە دەست نیشان دەدەکەین بۆنمونە ۳۰ خانە لە ستونی بریکارەکان دەست نیشان دەکەین ئاماژە بێت بە یەک مانگ، دەست نیشان کردن هەمان شێوەی دەست نیشان کردنە لە هەر بەرنامەیەکی کۆمپیوتەردا، دوایی دەچین کلیک لەسەر (AUTOSUM) دەکەین وەک لە وێنەی ژمارە (۲) بەڵام تاکو کۆی گشتی فرۆشتن بەشێوەیەکی خۆکاری لەگەڵ فرۆشتنی شەکردا زیاد بکات پێویست ئەم هەنگاوە جێبەجێبکەین، کلیک لەسەر (FX) دەکەین لە وێنەی ژمارە (۳) دەست نیشان کراوە دوایی کلیک لەسەر OK دەکەین لەو چوارگۆشەی کە دێتە پێشمان دواتر لەو چوارگۆشەیەدا کە لەوێنەی (٤) دیارە نەخشە کە دەنوسین کەبریتیە لە کرداری کۆکردنەوەی سەرجەمی کرینی شەکرەکە لەلایەن وەکیلەکانەوە بەم شێوەیە (B30+D30+C30 +D30 .......) بەم شێوەیە کلیک لەسەر OK بکە یان راستەوخۆ ئینتەر، وە مەرجە لێرەدا ئەو خانە دەست نیشان بکەین کە ئەنجامەکەی تێدا دەرکەوێت بۆ نمونە ئێمە سەرەوەمان هەڵبژاردوە کە رێک بەردەوام دیارە، وێنەی ژمارە پێنج نەخشەکەیە بە تەواوەتی، خاوەنی گەنجینەکە کاتێک یەک تەن بفرۆشێت ئەوا خۆکاری هەموو ئەوکرادارانەی کەنوسراون جێبەجێدەبن، ئەوەی شایەنی باسبێت ئەم کردارە بۆ کەم کردن و کۆکردنەوە لێدەرکردن و دابەشکردن وەک یەکە . بۆ نمونە ( D3*E5*K4 ) یان ( A2/A5/D7 ).



وێنەی ژمارە (۳)



وێنەی ژمارە (٤)



وێنەی ژمارە (٥)

# زنجیرەی (٣) بۆ بەرنامەی fixit

# چارەسەرکردنی کێشەکانی کۆمپیوتەر

باوکی ئاشنا

لەم زنجیرەدا باس لە چارەسەر کردنی کێشەی کۆمپیوتەر دەکەین (FIX) چونکە زۆرجار کۆمپیوتەرەکەمان هەندێک وردە کێشەی توش دەبێت و کاریگەری دەبێت لەسەر کۆمپیوتەردا بۆیە پێویستە بەهەر بەرنامەیەک بێت چارەسەری بکەین چونکە زۆرجار فۆرمات کردن چارەسەرە بەڵام کولفەی زۆرەو ماندبونی دەوێت ئەم بەرنامەیە زۆر دەوڵەمەندەو دەتوانێت ئەم کردارە ...ی بگەینێت:

لەسەرەتادا بەرنامەکە هەڵدەبژێرین لە لیستی بەرنامەکانی خۆی بەم شێوەی وێنەی ژمارە (١) دواتر وەک لەوێنەی ژمارە (٢) دیارە بەرنامەکە بەم شێوەیە دەکرێتەوە توش ئەو بەشە هاردانە دەست




وێنەی ژمارە (١)




وێنەی ژمارە (٢)




وێنەی ژمارە (٣)



وێنەی ژمارە (٤)



وێنەی ژمارە (٥)

نیشـان دەکەین کە کردارەکەی تێیدا جێ بـە جێ بکات، دواتر بـۆ زیاتر گرنگیدان بـەم کارە لـە خـوارەوە کلیـک لەسـەر (SETTING) بکـە تاکو بتوانیت زیاتر ورد بێـت لە کارەکەدا وەک لـە وێنەی ژمارە (٣) دیـارە، دواتـر کلیک لەسـەر NEXT دەکەین یەکسەر دەست دەکات بە گەڕان و کارکردن لـە بەجێگەیاندنی فەرمانەکە بەم شـێوەیە تاکـو دەگاتـە ١٠٠٪ وەک لەوێنەی ژمارە (٥) دیارە دوای تەواو بون راپۆرتێکمان دەداتێ داوای خەزنکردنمان لێدەکات بڕوانە وێنەی ژمارە (٦)



وێنەی ژمارە (٦)

# بەرنامەی (Recover4all)

ئامادەکردنی: مسعود میرزا

زۆرجار ئێمە کەشتێکمان لێ دەسڕێتەوە لەکۆمپیوتەر پەنادەبەینە بۆ ریسایکل بن بۆ گەڕاندنەوەیان بەڵام ئەگەر لەوێش نەمابوو ناچار ناتوانین جارێکی تر ئەو شتە پێویستە بگەڕێنینەوە بۆ ناو کۆمپیوتەر لەوکاتەدا بەرنامەی R4A ئاسانکاریمان بۆدەکات دەتوانێ هەموو ئەوشتانەی کەسڕاوەتەوە جارێکی تر بیان گەڕێنینەوە بۆناو کۆمپیوتەرەکانمان.

**چۆنیەتی کارکردن ..**

بەرنامەکە پێویستی بەدابەزاندن ناکات خۆی لەناو فۆڵدەرێکە بەرنامەکە دەکەینەوە بەم شێوەیە، وێنەی ژمارە (١).

ئینجا ئەوشتەی کە کەسڕاوەتەوە لەچ هاردێک لەدەستمان کەسڕاوەتەوە ئەوهاردە هەڵدەبژێرین لەبەرنامەکە تەنها هێمای + کە لە تەنیشتی دەکەینەوە بەم شێوەیە...

دەبینین هەموو ئەوشتانەی کەسڕاوەتەوە هاتونەتە ناو بەرنامەکەوە لەوێوە دەتوانین ئەوشتەی پێویستمانە بهێنینەوە بۆ ناو کۆمپیوتەر، وێنەی (٢).




وێنەی ژمارە (١)




وێنەی ژمارە (٢)

# زنجیره (٣) بۆ فێربوونی پرۆگرامی ئەکسێس ٢٠٠٣

ئامادەکردنی : ڕێبوار نوری سعید

## دروست کردنی خشته:

خشـتـه TABLE ئەو شـوێنەیه که داتای تێدا کۆگەدەکرێت و خاڵی دەستپێ کردنە لە دروست کردنی بنکەی زانیاری.

ئەگەر تەماشای ئەم خشتەیە خوارەوە بکەین کە بەرنامەی ئێکسـل دروست کراوەو زانیاری لەسـەر کۆمەڵە پەرتووکێک تێدا کۆگەکراوە، ئەبینین کە بەشـەکانی خشتە بریتین لە چەند ستوونێک و ریزێک، هەر ستوونێک بە کێڵگە FIELD ناو دەبرێت و داتـای ناو هەمـوو کێڵگەکان کـە لەیەک ریزدابـن زانیاری لەسـەر یەک پەرتووک ئەبەخشـێت بۆیە بـە تۆمار RECORD ناودەبرێت، ئەگەر تەماشـای داتای نـاو هەر کێڵگەیەک بکەین دەبینیـن کە هەر کێڵگەیەک یەک جۆر داتا لە خۆی دەگرێت بۆ نموونە: کێڵگەکانی (زنجیرە، ژمارەی لاپەرەکان، دانە) داتاکەیان لە جـۆری ژمارەیـە NUMBER، کێڵگەکانی (نـاوی پەرتووک، ناوی دانەر) داتاکەیان لەجۆری تێکستە TEXT، کێڵگەی (ڕۆژی دەرچوون) داتاکەی لە جۆری بەرواره وە هەرەوها کێڵگەکانی (نرخ، بر) داتاکەیان لەجۆری پارەیە CURRENCY.

| زنجیره | ناوی پەرتووك | ناوی دانەر | ژمارەی لاپەرەكانی | رۆژی دەرچوون | شوێنی دەرچوونی | ژمارە | نرخ | بر | تێبینی |
|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|
| 1 | زمانی كوردی | [illegible] | 100 | 19/6/2005 | هەولێر | 10 | $10 | $100 | |
| 2 | چیرۆكی منداڵان | [illegible] | 10 | 20/6/2005 | هەولێر | 8 | $10 | $80 | |
| 3 | فێربوونی كۆمپیوتەر | [illegible] | 20 | 21/6/2005 | هەولێر | 7 | $10 | $70 | |
| 4 | فێربوونی ماتماتیك | [illegible] | 30 | 22/6/2005 | سلێمانی | 11 | $10 | $110 | |
| 5 | فیزیا | [illegible] | 40 | 23/6/2005 | هەولێر | 12 | $10 | $120 | |
| 6 | فێربوونی WORD | [illegible] | 60 | 24/6/2005 | سلێمانی | 9 | $10 | $90 | |
| 7 | زانستی كۆمپیوتەر | [illegible] | 85 | 25/6/2005 | هەولێر | 6 | $10 | $60 | |
| 8 | [illegible] | [illegible] | 75 | 26/6/2005 | سلێمانی | 5 | $10 | $50 | |
| 9 | [illegible] | [illegible] | 65 | 27/6/2005 | هەولێر | 4 | $10 | $40 | |
| 10 | [illegible] | [illegible] | 82 | 28/6/2005 | سلێمانی | 13 | $10 | $130 | |
| 11 | [illegible] | [illegible] | 72 | 29/6/2005 | هەولێر | 15 | $10 | $150 | |
| 12 | [illegible] | [illegible] | 62 | 30/6/2005 | سلێمانی | 16 | $10 | $160 | |
| 13 | [illegible] | [illegible] | 48 | 1/7/2005 | سلێمانی | 11 | $10 | $110 | |
| 14 | [illegible] | [illegible] | 62 | 2/7/2005 | سلێمانی | 9 | $10 | $90 | |
| 15 | [illegible] | [illegible] | 62 | 3/7/2005 | هەولێر | 10 | $10 | $100 | |

خشتەی (١)

ئەگـەر سـەرنجی کێڵگەی زنجیـرە بدەین ئەبینیـن کە هەر تۆمارێـک ژمارەیەکـی تایبـەت بەخـۆی هەیە لـە زنجیرە بە بـێ دووبارەبوونـەوە، ئەمـەش وەک کلیلێـک دادەنرێـت بـۆ ئاسـانکردنی جیاکردنـەوەی تۆمـارەکان لەیەکتـری بە کلیلی سەرەتایی PRIMERY KEY ناو دەبرێت.

لە بەرنامەی ئەکسـێس خشـتـە بە چەند ڕێگەیەک دروسـت دەکرێت لەوانە:

١-ڕێگای DESIGN VIEW. ٢-ڕێگای DATASHEET VIEW.
٣- ڕێگای TABLE WIZARD. ٤- ڕێگای IMPORT TABLE.
٥- ڕێگای LINK TABLE.

یەکەم: ڕێگای DESIGN VIEW.

ئەم ڕێگایە بە باشترینیان ئەزانرێت بۆ دروستکردن ودیزانی خشتە بە پێی ئامانج و پرۆژەی جۆراوجۆر، بۆ ئەم مەبەستەش ئەم هەنگاوانەی خوارەوە بکە:

١- بنکـەی زانیـاری مەبەسـت بکـەوە (ئەبێ فایلـی بنکەی زانیاری کراوەبێت).

٢- لـە چوارچێـوەی بنکـەی زانیاری وەلەشـریتی تەنەکان OBJECTS یـەک کلیـک بکە لەسـەر TABLES، ئنجا دوو کلیک بکە لەسـەر دەستەواژەی CREATE TABLE IN DESIGN VIEW، (وێنـەی١) یـان (لە جیاتی ئەوە ئەتوانیت کلیک بکەیت لەسـەر دوگمـەی NEW لە شـریتی ئامرازەکانی بنکـەی زانیاری ئنجا خانەیەک دێتە پێشـەوە یەک کلیک بکە لەسەر DESIGN VIEW ئنجا کلیک بکە لەسەر دوگمەی OK) (وێنەی ٢).




وێنەی (١)

دوای ئەوە خانەی دیزاینی خشتە دێتە سەر شاشەکە، لێرەدا دەسـت ئەکەیـت بە پێناسـە کردنی هەر کێڵگەیـەک و جۆری داتاکەی، بۆ دیزاین کردنی ئەو خشتەیەی سەرەوە (خشتەی١) ناوی کێڵگەکان و جۆری داتاکەی خاسیەتی کێڵگەکە دیار بکەو




وێنەی (٢)

| ناوی کێڵگە Field Name | جۆری داتا Data Type | ڕوونکردنەوە Description |
|---|---|---|
| S. Number | Auto number | زنجیرە |
| Book Name | Text | ناوی پەرتووک |
| Author Name | Text | ناوی دانەر |
| Pages | Number | ژمارەی لاپەڕەکانی |
| Publishing Date | Date | ڕۆژی دەرچوونی |
| Publishing Place | Text | شوێنی دەرچوونی |
| Published Quantity | Number | تیراژ |
| Unit Price | Currency | نرخ |
| Amount | Currency | بڕی کۆی نرخەکان تیراژ |
| Notice | Memo | تێبینی |

لە خشتەیەک دا بۆئاسانکردنی کارەکەت تۆماری بکە وەک ئەم خشتەیەی سەرەوە.

تێبینی: بۆ نووسینی ناوی کێڵگەکان، وا باشترە کەبە زمانی ئنگلیزی بێت تاکو دووربیتەوە لە هەڵەکردن، هەوەروەها ڕەچاوی ئەوە بکە کە لە نووسینی ناوی کێڵگەدا جگە لە (! و.) کەنابێ بەکاربێت بۆ نووسینی ناوی کێڵگە ئەتوانیت تێکست، ژمارە، SPACE یان هەرسێکیان بەیەکەوە بەکاربێنی، بەڵام واباشترە کە ئەگەر ناوی کێڵگەیەک لەدوو ووشە پێک هاتبوو SPACE لە نێوانیاندا بەکارنەهێنیت لە بری ئەوە پیتی یەکە لە هەر ووشەیەک بە گەورە بنووسە.

٣- بۆ پێناسە کردنی کێڵگەکان، یەک کلیک بکە لەناو ستونی FIELD NAME دەست بکە بە نووسینی ناوی کێڵگەکەو ئنجا TAB دابگرە، نیشانەکە ئەچێتە ستوونی DATA TYPE کە بەشێوەیەکی بەرایی جۆری TEXT هەڵئەبژێرێت وە لیستەکە بکەوە بۆ گۆرینی جۆری داتاکەو دوای ئەوە جارێکی تر TAB دابگرە نیشانەکە ئەچێتە ستوونی DESCRIPTION ئنجا شتێک بنووسە بۆ روون کردنەوە لەسەر داتای هەر کێڵگەیەک چونکە



وێنەی (٣)

ئەوەی لێرەدا دەی نووسیت لە شریتی باری بەرنامە STATUS BAR دەردەکەوێت کە دەکەوێتە خوارەوەی چوارچێوەی بەرنامە.

٤-بۆ نووسینی ناوی کێڵگەکانی خشتەی سەرەوە لە ستوونی FIELD NAME وە دەست نیشانکردنی جۆر داتای هەر کێڵگەیەک، دەست بکە بە نووسینی SNUMBER لە ژێر ستوونی FIELD NAME ئنجا TAB دابگرە، نیشانەکە ئەچێتە ستوونی DATA TYPE وجۆری TEXT هەڵبژێرە، دوای ئەوە TAB دابگرەو نیشانەی نووسین ئەچێتە ستوونی DESCRIPTION لەم خانەشدا روون کردنەوەیەک لەسەر کێڵگەکە بنووسە (زنجیرە).

٥- بۆ نووسینی ناوی کێڵگەیەکی تر TAB دابگرە، بەهەمان شێوە ناوی کێڵگەکانی تر بنووسەو جۆری داتایان دیاری بکە لە گەڵ نووسینی روونکردنەوەیەک لەسەر هەرکێڵگەیەک وەک لە (وێنەی ٤) پیشان دراوە.



وێنەی (٤)

٦- پێش ئەوەی فایلەکە کۆگە بکەیت، ئەبێ کیلگەیەک بکەیت بە کلیل بۆ بنکەی زانیاریەکەت، بۆ ئەمە مەبەستەش،یەک کلیک لە تەنیشتی لای چەپی SNUMBER بکە بۆ هەڵبژاردنی ئەنجا یەک کلیک بکە لەسەر دوگمەی کلیک لە شریتی ئامرازەکان،



وێنەی (٥)

وێنەی کلیلێک لە تەنیشت ناوی SNUMBER دەردەکەوێت، وە ئەم کلیلە بۆ هەر تۆمارێک ژمارەیەک دائەنێت رێگە نادات بۆ یەکێکی تر دووبارە بێتەوە، لەم حاڵەتدا ئاسانکاری دەکات لە دۆزینەوەی داتای تۆمارەکان.

٧- کۆگەکردنی خشتە TABLE: بۆ کۆگەکردنی خشتە، لیستی FILE بکەوەو کۆماندی SAVE هەڵبژێرە. دوای ئەوە خانەیەک دێت داوای ئەوەت لێ دەکات ناوێک بۆ خشتەکەت بنووسی، تۆش ناوی بنێ TBLBOOKS، کلیک بکە لەسەر دوگمەی OK.

٨- ئنجا کلیک بکە لەسەر دوگمەی داخستن X لە چوارچێوەی دیزاینی خشتە.

کردنەوەی خشتە:

بۆ کردنەوەی هەر خشتەیەک، یەک کلیک بکە لەسەر TABLES لە شریتی OBJECTS ئنجا دوو کلیک بکە لەسەر ناوی خشتەکە (TBLBOOKS).

# ئاگاداری

بۆ هەموو ئەو بەڕێزانەی کە توانای نووسینیان هەیە لە بواری کۆمپیوتەر و ئەنتەرنێت ئەگەر توانای نووسینی بابەتیان هەیە لەم بوارەدا دەتوانن بەشداری بکەن لە گۆڤاری کۆمپیوتەر و دەتوانن سەردانمان بکەن یان بابەتەکانیان بنێرن بۆ ئەم ناونیشانە : هەرێمی کوردستانی عێراق / یەکەی کۆمپیوتەر لە دیوانی وەزارەتی رۆشنبیری جادەی شەست مەتری نزیک هۆڵی زەرد یان پەیوەندی بکەن بە سەرنووسەرەوە بەم ناونیشانە مەڵبەندی کۆمپیوتەری ئاراس هەولێر بەرامبەر قەڵا باڵەخانەی قەیسەری حاجی یەحیا نهۆمی دووەم یان بە ژمارە تەلەفۆنی 2232721 مۆبایل 07504618045 یان پۆستی ئەلکترۆنی

EMAIL : COMPUTER_MAGAZINE_2005@YAHOO.COM

EMAIL : ARAS_CO_CENTER@YAHOO.COM

تێبینی :

*هەر بابەتێک بڵاو بکرێتەوە پاداشتی پێ دەدرێت .

* هەر بابەتێک لە شوێنێک یان گۆڤارێکی تری کوردی بڵاوکرابێتەوە ئێمە بڵاوی ناکەینەوە.

* بابەتەکانتان ئەگەر نەشیا بۆ بڵاوکردنەوە ئەوا ناگەڕێتەوە.

*هەر کەسێک بابەت ئەنێری بۆ بڵاو کردنەوە با بابەتەکەی لەسەر فلۆپی دیسک یان فلاش میموری بێت و وێنەی ڕوونکەرەوەکان بەجیا لە نێو فولدەرێک دا بێت و بابەتەکەی بە بەرنامەی MICROSOFT WORD بنووسێت.

* هەر کەسێک بابەتی وەگێران ئەنێرێ با ئاماژە بکات بەسەرچاوەکەی.

# چۆنیەتی زیادکردنی دەنگ دانەوە (صدی) لەبەرنامەی cool edit pro



وێنەی ژمارە (١)



وێنەی ژمارە (٢)

ئامادەکردنی: کاوە سلێمان

سەرەتا ئەو دەنگەی پێویستمانە (OPEN)ی دەکەین بۆ ناوبەرنامەکە پاشان ئەوشوێنەی پێویستمانە گۆڕانکاری تێدابکەین بەماوس دیاریدەکەین ئینجا دێن لەنووسراوەکانی سەرەوە (EFFECTS) هەیە بەماوس کلیکی لەسەر دەکەین ئەم لیستە دەبێتەوە لەوێوە چەند شتێک دیاردەکەوێت لەوانە (DELAY EFFECTS) وێنەی ژمارە (١) لەوێوە چەند شتێکی تر وەکو CHORUS DELAY DYNAMIC DELAY ECHO و چەند شتی ترکە هەریەک لەوانە چەند کارێک ئەنجام دەدات لەدەنگ دانەوە ئەگەر بێت و هەریەک لەوانە دابگری ئەم لیستە دەکەوێتە بەرچاو وێنەی ژمارە (٢) هەروەها دەتوانی لەرێگای (PREVIEW) گوێ لەکارەکانمان بگرین گۆڕانکاریەکان ببیستین ئینجا پاش تەواوبوونی کارەکان OK دەکەین پاشان (SAVE AS) دەکەین بۆ کۆتایی هێنان بەکارەکە.




وێنەی ژمارە (١)

## زنجیرەی (٣) لە بەرنامەی میدیا ستۆدیۆ

# چۆنیەتی کرۆمکردنی نووسین

ئامادەکردنی: فاخر محمود میرزا

ئەم کارە زۆرگرنگەو زۆریش پێویستیمان پێی دەبێت لەبەرئەوەی زۆرجار لەکاتی مۆنتاج یان دروستکردنی ریکلام پێویستیمان بەنووسین دەبێت لەسەرڤیدیۆ واتا تایتل . بەرنامەی میدیا ستۆدیۆ لەبواری مۆنتاج دەورێکی زۆربەرزی هەیە زۆرکاری گرنگی پێ ئەنجام دەدرێت بەلام بەداخەوە نووسینی کوردی لەناوەخۆی نانووسێت دەبێت لەوکاتە پشت بەبەرنامەیەکی تربەستین بۆ نووسینەکانمان وەک فۆتۆشۆپ ووۆرد و پاوەر پۆینت و پەینت و زۆربەرنامەی تر بەلام باشترین بەرنامە کەزۆر پەیوەندی لەگەڵ میدیا ستۆدیۆیە بەرنامەی فۆتۆشۆپە نووسینەکە لەوبەرنامەیە دەنوسین بەلام دەبێت نووسینەکە پشتی تاریک بێت واتا پشتی سپی نەبێت هەروەها نوسینەکە بەفایلی جۆری فۆتۆشۆپ PSD خەزن دەکەین.

لەخوارەوەی بەرنامەی میدیاستۆدیۆ لەسەر هێلە سپییەکان بەلای ڕاستی ماوس کلیکیک دەکەین ئەم لیستە دەکەوێتە بەرچاو وێنە (١).

(IMAGE FILE) هەڵدەبژێرین لیستی هاردەکان دیاردەکەوێت ئەو تایتلەی لەناو هاردەکە دامان ناوە (OPEN) ی دەکەین بەم شێوەیە، وێنە (٢).

بەمەرجێک دەبێت تایتلەکە لەڕیزەوی چوارەم یان پێنجەم دابنێین چونکە



وێنەی ژمارە (٢)



وێنەی ژمارە (٣)

بۆشایی یەکەم بۆوێنە و ڤیدیۆیە دووەمیش بۆ ئیفێکتە هی سێیەمیش هەر بۆ ڤیدوو وێنەیە ئینجا کلیکی ڕاست ...ر تایتلەکە دەکەین لیستێکی درێژ دێتە بەرچاو لەناوەڕاستی لیستەکە (OVERLAY OPTION) هەڵدەبژێرین بەم شێوەیە وێنە (٣) ئینجا لیستێکی نوێ دەکەوێتە بەرچاو دەتوانین لەو لیستەوە کرۆمەکەی زۆربکەین یان کەم بکەینەوە ئینجا دەبینین نووسینەکە لەلای چەپ دیارە بەتەنها بۆخۆی و چواردەوری سپییە هەروەها لەلای ڕاستیش نووسینەکە کەوتوتە سەر ڤیدیۆکە واتا کرۆم بوە ئینجا OK دەکەین بەم شێوەیە تایتل کرۆم دەبێت وێنە (٤).




وێنەی ژمارە (٤)

# بەرنامەی STREAMBOX - RIPPER



وێنەی ژمارە (١)

ئا: دیلمان نەورۆز

ئەم بەرنامەیە یارمەتیمان دەدات بۆگۆرینی دەنگ بۆ جۆری (MP3) بەشێوەیەکی ئاسان هەروەها دەتوانی چەند گۆرانیەک بەیەکەوە بگۆری بۆ (MP3) بەقەبارەیەکی زۆربچوک بێ ئەوەی دەنگەکە تێک بچێت.

### چۆنیەتی کارکردن

پاش دابەزاندنی بەرنامەکە لەسەر کۆمپیوتەر ئایکۆنێک دێتە سەر شاشە ئەو ئایکۆنە کاری پێناکرێ دەگەرێینەوە بۆسەر ئەو نیوفۆڵدەرەی بەرنامەکەی تێدایە یەک لەوانە ناوی (RIPPER) ە دووجار بەماوس کلیکی لەسەر دەکەین بەرنامەکەدەبێتەوە ئەگەر بمانەوێ گۆرانی تاک تاک بکەینە (MP3) دێن لەخوارەوەی بەرنامەکە (LOAD) کلیک دەکەین بەماوس ئینجا لیستی هاردەکان دەبێتەوە بەشێوەیەی وێنە (١). پاشان ئەو دەنگەی کەدەمانەوێ بیگۆرین بۆ (OPEN MP3) ی دەکەین ئینجا (CONVERT) کلیک دەکەین ئەم لیستە دەکەوێتە بەرچاو وێنە ٢ لەلای راست لەسەرەوە (CHANGE) نوسراوە ئەوەیان بۆ دانانی دەنگەکەیە لەچ هاردێک دایدەنێی هەرەها لەژێر ئەوەدا لەناوەراست (STEREO) هەیە دەیگۆرِی بۆ (MONO) بۆئەوەی بە ڤیدیۆ سیدی و بەکۆمپیوتەر کاربکات ئینجا (OK) دەکەین بەلام ئەگەر بمانەوێت چەند گۆرانیەک بەیەکەوە بکەینە (MP3) دێین لەخوارەوە ی بەرنامەکە (BATCH) کلیک دەکەین ئەم لیستە دەکەوێتە بەرچاو وێنە (٢).

دوو بۆشایی لەسەرەوە هەیە یەکیان (INPUT) ە ئەوەیان بۆهێنانی دەنگەکەیە بوناو بەرنامەکە لەبەرامبەری چەند خاڵێک هەیە کلیک دەکەین بەماوس لیستی هاردەکان دەبێتەوە بەم شێوەیە وێنە ٣ بەمەرجێک کۆمەلە گۆرانیەکە لەناو فۆڵدەرێک بێت یەک جار کلیک لەسەر فۆڵدەرەکە دەکەین ئینجا (OK) دەکەین ئەویتریان (OUTPUT) بۆخەزنکردنی (MP3) یەکەیە لەچ هاردێک بێت.



وێنەی ژمارە (٢)





# هێڵەکانی ڕێنمایی لە فۆتۆشۆپ (Guides)

ئامادەکردنی: عەزیز ئەسعەد

هێلە ڕێنماکان هێڵی شاراوەی خەیالین و لەگەڵ سانایی بەکارهێنانیان گرنگیەکی زۆریان هەیە لە کاتی ئیش کردن لەسەر بەرنامەی فۆتۆشۆپ. ئەم هێڵانە وەکو پێوەرێک بەکاردێن بۆ دابەش کردنی ڕووبەری ئیش کردن.

بۆ نموونە: بۆئەوەی بتوانی دوو وێنە یان دوو ڕستە نووسین لەهەمان ئاست دابنێین دەتوانین بەهۆی ئەم هێلانەوە ئاستەکانیان ڕێک بخەین .

لەهەمان کاتدا بەکاردێت بۆ گەمارۆدانی هەر دیار کردن ( تحدید ) ێک کە بمانەوێت لەسنورێکی دیاری کراودا دەرنەچێت.

وەکو گوتمان ئەو هێڵانە شاراوەن، بۆ دیاری کردنیان ئەم هەنگاوانە دەنێین:

١- دیاری کردنی هەردوو ڕاستەی ستونی و ئاسۆیی ئەمیش بەهۆی (VIEW SHOW ROLERS) دەبێت .

٢- ئاراستەکەری ماوسەکە دەبەینە سەر ڕاستەکەو لەگەڵ کلیک کردنی ڕایدەکێشین .

٣- هێڵێکی باریکی شینت لەسەر فایلی وێنەکە بۆ دەردەکەوێ .

وەک لەوێنەی ژمارە ( ١ )

بۆ نموونە: بەهۆی هێلە ڕێنماکان دەتوانین ئەم دوو ڕستە نوسینە لەگەڵ ئەم دوو وێنەیە لەهەمان ئاست دابنێین . وەک وێنەی ژمارە (٢)

هەروەها ئەگەر بمانەوێت بۆ نموونە شێوەی ئەم بازنەی خوارەوە وەرگرین کە لەوێنەکەدا هەیە بەهەمان شێوە پێویستیمان بە هێلە ڕێنماکان دەبێت بۆ ئەوەی بتوانین دیارکردن (تحدید) وکەمان شێوە بازنەی ناو هێلەکان وەربگرێت. وەک وێنەی ژمارە (٣)

دەتوانین ڕەنگی ئەم هێڵانە بگۆڕین لەهەمان کات واپیشانی بدەین کە بەشێوەی هێڵی پچڕ پچڕ دیار بکەوێ ئەمیش بەم شێوەیەی خوارەوە :

EDIT PREFERENCE GUIDE & GRADE




وێنەی (١)




وێنەی (٢)

بۆ لابردن و قفل دانی ئەم هێڵانە دەتوانین ئەم هەنگاوانە بنێین :

بۆ قفل دانی هێلەکان VIEW LOCK GUIDES

بۆ لابردنی هێلەکان VIEW LOCK GUIDES

هەروەها دەتوانین ئەم هێلانە لەشوێنی مەبەست دیاری بکەین بەپێی ئەو پێوەرەی کە دەمانەوێت بەم شێوەیەی خوارەوە :

VIEW NEW GUIDE

وەک وێنەی ژمارە ( ٤ ) .

# کۆمەڵێک سایتی فێرکاری

هەر وەک لە ژمارەکانی پێشووتری ئەم گۆڤـارە کۆمەڵێک سـایتی جۆرا و جۆرمـان بۆتـان ئامـادە کردبـوو لـەم ژمارەیەشـدا کۆمەڵێـک سـایت و ماڵپـەری بەهێـز بـۆ فێرکردنـی سیسـتەم و بەرنامەکانـی تایبەت بە ئامێـری کۆمپیوتـەر و ئەنتەرنێـت بـە زمانـی عەرەبـی مـان بۆتـان ئامـادە کـردووە تـا ئێـوەی بەڕێـز سـوودیان لێ وەربگرن بۆ فێربوونی بەرنامەکانی کۆمپیوتەر و ئەنتەرنێت.

بەرنامەکانی نەخشە کێشان و وێنە (التصميم و الرسم)
HTTP://MOOJ3.JEERAN.COM/03RASMTASMEEM.HTM

بەرنامەکانی فلاش وسویش
HTTP://MOOJ3.JEERAN.COM/10FLASSWATSH.HTM

سیستەمی ویندوزXP
HTTP://MOOJ3.JEERAN.COM/17WINXP-OFFICE.HTM

بەشەکانی ئۆفیس
HTTP://MOOJ3.JEERAN.COM/07OFFICE.HTM
HTTP://WWW.OOFF.ITGO.COM/AMAIN.HTM

چەند سایتێکی تایبەت بە بەرنامەکانی جافا سکربت
/HTTP://MYJAVA.CJB.NET
/HTTP://DOOOL.CJB.NET
/HTTP://DES4ARAB.COM
HTTP://INTERNET.FARES.NET/AR
HTTP://WWW.BLADE4ARAB.F2S.COM/INDEX-BLADE.HTML

و ئەمەش سایتێکە ترە کە لە فێر کردنی چەند بەشێکی وەکوو کۆدەکانی جافا و هەروەها بەشێکی فێرکاری بەرنامەی فرۆنت پەیجی ٢٠٠٠ و بەرنامەی فلاش و فیژوال بێسک لە خۆ گرتووە.
/HTTP://WWW.SAUDINT.COM




وێنەی (٣)




وێنەی (٤)

## زنجیرەی (٣) لە بەرنامەی ماڵتی بیڵدەر

# چۆنیتی دانانی جوانکاری لە نێوان پەڕەکانی Autorun لە کاتی پەڕ هەڵدانەوە




وێنەی (١)

ئا: باوکی ئاڵا

بەرنامـەی ماڵتی میدیـا بیلدەر وەکوو بەرنامەکانـی تری تایبەت بە درووسـت کردنی شـێوەی کردنەوەی ڕاستە و خۆ کاری جوانـکاری و گۆرانـکاری ئەنجام دەدات بۆ ئەنجام دانی ئەو جۆرە کارەش دەتوانن بەم شێوەیە ئەم کارە بکەن .

سـەرەتا دوای ئـەوەی لـە زنجیرەی پێشوو باسـی چۆنێتی درووست کردنی چەند پەڕێکمان بۆتان کرد ئێستا دەچینە سـەر باسـی ئـەو کـردارەی کـە چۆن جوانـکاری لە نێوان ئەو پەڕانە دابنێن تا شـێوەی کردنەوەی ڕاستە و خۆیەکە بە جوانترین شێوە دەربچێت و ئەو کەسەی کە بـەکاری دێنێ پێی جوان بێت بۆ ئەم مەبەسـتە دەبێت لە بەشـی خـوارەوەی ڕووبـەری بەرنامەکـە دوو جـار کلیکی لای چـەپ بکەین لەسـەر پـەری دیاری کراو ئنجا شێوەیەکمان بۆ دەردەکەوێت لەو شـێوەیەدا دەچینە سـەر بۆشایی (PAGE TRANSITION) بڕوانـە وینـەی ژمارە(١)

دواتر بۆشاییەکە دەکەینەوە ئنجا دوای ئەوە یەکێک لـەو جوانکاریانە هەڵبژێرن کە خۆتـان دەتانەوێت ئنجـا دوای ئەوە دەتوانن بۆ ئەوەی لە کاتی چوونە سـەر لاپەڕێکـی تر ئەم جوانکاریە کاری خۆی بـکات ئـەوە دەبێت بچنە سـەر بەشـی (SCRIPT) لەسـەر ئەو بەشە یەک کلیکی لای چـەپ بکـە تا شـێوەیەکی ترتان بۆ دەکرێتـەوە ئنجا لە ناو ئەو شـێوەیەش دەتوانـن بچنە سـەر بەشـی (WIZARD) بڕوانە وێنەی ژمارە (٢).

دواترلەویـش یـەک کلیکـی لای چەپ بکە ئنجا لیسـتێکتان بـۆ دەکرێتەوە لەو لیستەدا فەرمانی (NEXTPAGE) هەڵبژێرە بڕوانە وێنەی ژمارە (٣).

دواتر کلیک بکە لەسـەر فەرمانی OK ئنجـا جارێکی تـر OK و جارێکی تریش هـەر هەمـان فەرمان بـەکار بێنە OK لە کۆتاییدا دەبینی شـێوە ڕاستە و خۆیەکە دەبێتە شـێوەیەک لە کاتـی هەڵدانەوەی پـەڕەکان جوانـکاری بـۆ زیـاد بـووە دەتوانن ئەم هەنگاوانە بۆ شێوە ڕاستەو خۆیەکانتان دابنێن .

# (ئەدۆب ئەکرۆبات) وکتێبە ئەلیکترۆنیەکان




ئا: لاڤە زەردەشت

بەردەوامی پێشکەوتنەکان بەندن بە بەردەوامی داهێنان، وە بە بەردەوامی هێشتنەوەی داهێنراوەکان . لە دوای دروست کردنی یەکەم کۆمپیوتەر و تاکو ئەمرۆ ئەم تەکنەلۆژیا گرنگە بەرەبەرە گەشەی سەندوە چەندان گۆرانکاری و نوێگەری تێدا کراوە لە بچوک کردنەوەی قەبارەکەی و لە دروست کردنی بەرنامەی بە کەڵک و بە سوود، لەم پێودانگەدا چەندان کۆمپانیای بەرهەمهێنانی بەرنامەکانی کۆمپیوتەر دامەزران گرنگترینیان کۆمپانیای مایکرۆسۆفت بوو کە تاکو ئێستاش زۆرترین بەرنامەی کۆمپیوتەری دروست کردوە یەکێک لە داهێنراوە دەگمەنەکانی ئەم کۆمپانیایە دروست کردنی بەرنامەی ئەدۆب ئەکرۆباتە (بەرنامەی خوێندنەوەی کتێبە ئەلیکترۆنیەکان)

ئەم بەرنامەیە خاوەن تایبەتمەنیەکی زۆر گەورەیە تاکو ئێستاش زۆرترین ژیاری مرۆڤایەتی سوودی لێدەبینێت . قەبارەی ماڵپەڕەکانی ئەنتەرنێت و قەبارەی کۆمپیوتەرەکان سنوردارە بۆیە ناچارمان دەکات تا بەرنامەیەک هەبێت قەبارەی زانیاریەکان بچوک بکاتەوە، بۆ بڵاوکردنەوەی زانیاریەکان پێویستمان بە بابەتی قەبارەی بچوک هەیە تاکو بتوانین زۆرترین بابەت پەخش بکەین، فایلەکانی وۆرد و ئەکسڵ و هەموو فایلە تێکستیەکان قەبارەیەکی گەورە داگیر دەکەن بەمەش ڕێگا لە خاوەن ماڵپەرەکە دەگرێت کە نەتوانێت بابەتی زۆر لە ناو ماڵپەرەکەی دابنێت جگە لەمەش مەترسی تێکچون و لە ناوچونی زیاترە بەرنامەی ئەدۆب ئەکرۆبات ئەم کێشەیەی چارەسەر کرد، ئەم بەرنامەیە لە توانای داهەیە قەبارەی فایلەکان بچوک بکاتەوە لە گەڵ ئەوەشدا پارێزگاری لە تێک چون و لەناوچونی بابەتەکان دەکات.

لە گەڵ دابەزاندنی هەر بەرنامەیەکی پێشکەوتو گۆڕانی داهێنەرانە لە بوارەکانی خۆیدا بە خۆوە دەبینێت بە دەرکەوتنی ئەم بەرنامەیە ماڵپەرەکان هەڵسان بە گرنگی دان بە بڵاوکردنەوەی کتێبی بەسوود لە سەر شێوەی کتێبی ئەلیکترۆنی تا گەیشتە ئەو ڕادەی کتێبخانەی ئەلیکترۆنی هەیە بە ملیۆنەها کتێب بڵاو دەکاتەوە هەیانە بەخۆڕاین و هەشیانە بە بڕێک پارە چونکە وەکو باسمان کرد ئەم بەرنامەیە قەبارەی کتێبەکان بچوک دەکاتەو و دانان و دابەزاندنیشی لە ماڵپەرەکانی ئەنتەرنێت ئاسانە وە دەتوانێت مافی خاوەن کتێب و کتێبخانەکە بپارێزێت چونکە ناتوانرێت بە شێوەیەکی ڕاستەوخۆ دەسکاری نوسین وێنەکان بکرێت ئەمەش وای لە خاوەن کتێبەکان کردوە کە بەئاسانی کتێبەکانی خۆیان لە ئەنتەرنێت بڵاو بکەنەوە ئێستا لە سەرتانسەری جیهاندا لە ڕێگای ئەم بەرنامەیەوە کتێبە ئەلیکترۆنیەکان و ڕۆژنامە و گۆڤار و ڕاپۆرت و مەقالەی دورو درێژ بڵاو دەکرێنەوە. ئەم بەرنامەیە دوو بەشە بەشێکیان بۆ دروست کردنی پەڕەکانی پی دی ئێف PDF کە لە ڕێگای ئەم بەشەوە ئەگۆردرێن و قەبارەیان بچوک دەکرێتەوە جگە لە (ACROBAT DISLRTTER) بەرنامەی تریش هەن کە فایلەکان دەکەن بە پی دی ئێف وەکو (FAST PDF BUILDER REGISTERED). بەشی دوەم بریتیە لە ئەکرۆبات ریدەر (ACROBAT READER) کە ئەمە تەنها بۆ خوێندنەوەی پەڕەکانی پی دی ئێفە دوا ڤێرژنی ئەم بەرنامەیەش ساڵی ٢٠٠٥ کەچەندان گۆرانکاری تێدایە لە چاو ڤێرژنەکانی تر.




وێنەی ژمارە (١)

# دروست کردنی ئەلبومێکی ئەلیکترۆنی بە ڤیدیۆ ستۆدیۆ
## Ulead VideoStudio 8

حسن عمر حسن

زۆربەمان گلەیی ئەوە لە هاوڕێ و دۆستەکان دەکەین کاتێ سەیری وێنەکان دەکەین ماک و پیسی لە سەر بەجێ دەمێنێ، کە ئەمەش مایەی نیگەرانیە بۆ هەردوولا، بۆ ئەوەش بتوانین لەگەڵ نیشاندانی وێنەکان بە براو خزم دۆستانمان مۆسیقا و گۆرانی لە گەڵ دابێت و بە ستایلێکی جوان سەیری وێنەکان بکات و لە پیس بوون و ماک و لە کەبون بپارێزرێن و لە سوتان و وون بوون بپارێزرێن ئەوا دەتوانی ئەلبومی ئەلیکترۆنی بە بەرنامەی ڤیدیۆ ستۆدیۆ (VIDEO STUDIO 8) درووست بکەیت و بیخەیتە سەر سی دی بەبێ ئەوەی هیچ کێشەیەکمان بۆ دروست بکات لە گەڵ ئەوەشدا دەتوانین چەند دانەیەکی لێ کۆپی بکەین و وەکو ئەرشیف هەڵیانگرین بۆ ئەوەی لە مەترسی لەناو چون بپارێزرێن، لە هەمان کاتیشدا لە کێشەکانی دڕان و تێک چونی ئەلبومەکان ڕزگارت دەبێت جگە لەمەش ئەگەر خاوەنی ماڵپەڕی خۆت بیت ئەوا دەتوانیت وێنەکان لەناو ماڵپەڕەکەت ئەرشیف بکەیت بەمەش تاهەتایە لە لەناو چونیان ڕزگاریت دەبێ · جێ بەجێ کردن و درووست کردنیشی زۆر ئاسانە وە چەندان بەرنامەی تریش هەن بەلام هیچ کامیان ئەوەندەی بەرنامەی ڤیدیۆ ستۆدیۆ ئاسان نیە لە درووست کردنیدا وە لە ووردی کارکردن و ڕونی و جوانی ڕەسمەکان، لە سەرەتادا ئەبێ ئەو بەرنامەیە لە ناو کۆمپیوتەرەکەت هەبێ ئەگەر نەشبێ پێویستە دایبەزێنیت، دابەزاندنیشی زۆر ئاسانە . کە بەرنامەکەت کردەوە دوو هەڵبژاردەت بۆ دێت تۆ ئەوەی دووەم (EDITOR VIDEOSTUDIO) هەڵدەبژێری وەک لە وێنە (١) دا دیارە، ئینجا چاوەڕوان بکە تا بەرنامە دەبێتەوە، لە دواییدا کلیکی ڕاست لە سەر ئەم بۆشایەی لای خوارەوەی بەرنامەکە دەکەی تا ڕەسمەکان بهێنی وەک لە وێنەی ژمارە (٢) دا دیارە، ئەو ڕەسمانەی کە دەتەوێ بیکەیتە ئەلبوم دەیانهێنیت،ئینجا لە بەشی سەرەوەی

بەرنامەکـە دەچێتە (EFFECT) بۆ ئەوەی لە نێوان ڕسـمەکان ئیفێکت یاخود ناوبڕ دابنێت وەک لەوێنەی ژمارە (٣) دا دیارە، بۆ ئەمەش کە ئیفێکت لە ناو ڕەسـمەکان دابنێت پێویستە لە سـەر هەر ئیفێکتێک کلیکـی چـەپ بکەیـت ئینجـا کلیکەکـە بەرنەدەیت تا دەیبەیتە نێوان ڕەسمەکان ئینجـا بەرییدە، ئـەم کارە بـۆ هەمـوو نێوانی ڕەسـمەکان بکە، لە دوای ئەوەی کە ئیفێکتت بۆ هەموو نێوانە ڕەسـمەکان دانـا ئەمجـارە ئاوازێک یـان گۆرانیەک بـۆ ئەلبومەکـەت دابنێ، جا تـۆ دەتوانی ئەو مۆسـیقایە هەڵبژێـری کە بەرنامەکە هەیەتی یاخود ئەو مۆسیقایەی کە خۆت ئامـادەت کردوە بیهێنـی، بۆ هێنانی هەر پارچە مۆسیقایەک کلیکە ڕاست لە بەشی خوارەوەی بە رنامە دەکەی لەوێ دەچێتە




وێنەی ژمارە (٢)

وێنەی ژمارە (٣)

وێنەی ژمارە (٤)

سەر (INSERT AUDIO) لەوێش دوو هەڵبژاردە هەیە تۆ ئەگەر فایلی دەنگیت ویست ئەوا لە سەر ئەوەی یەکەمیان کلیک دەکەیت وە ئەگەر فایلی مۆسیقات ویست ئەوا لە هەڵبژاردەی دووەم کلیک دەکەی وەک ولە وێنەی ژمارە (٤) دا دیارە . ئێستاش لەدوای ئەوەی بویت بەخاوەن ئەلبومێکی ئەلیکترۆنی پێویستە سەیڤی بکەیت بە فایلی ڤیدیۆیی بۆ ئەمەش دەچیتە بەشی سەرەوەی بەرنامەکە کلیک لەسەر (SHARE) بکە وەک لەوێنەی ژمارە (٥) دا دیارە لە دوایدا کلیک لەسەر (SHARE VIDEO ONLINE) دەکەین لەوێش دانەیەک هەڵدەبژێری وەک لە وێنەی ژمارە (٥) دا دیارە و ئینجا سەیڤی دەکەیت.




وێنەی ژمارە (٥)

# چۆنێتی دەرخستنی نەشتەرگەریەکان بەهۆی بەرنامەی (CATHVIEWER)




ئا: فلۆرا عەلی

زۆرجار ئێمە حەزدەکەین شارەزایی لە کارەکانی پزیشک پەیدابکەین یاخود ئەونەشتەرگەریانەی پزیشک دەیکەن ئێمە ببیینین پزیشکەکانیش یارمەتیمان دەدەن بۆبینینی کارەکان بەشێوەیەک کاتی نەشتەر گەریەکان تەواو دەکەن کارەکانیان تۆماردەکەن بۆسەر سیدییەک ئەوسیدییەشمان دەدەنەوە بەڵام ئێمە نازانین چۆن ئەوسیدییە بەسەر کۆمپیوتەرو ڤیدیۆکان کاردەکات تەنها چەند فایلێک دیاردەکەوێت ئەم فایلانەش پرۆگرامن هیچ ڤیدۆنین لەم کاتەدا بەرنامەی (CATHVIEWER) ئاسان کاریمان بۆدەکات بەکارهێنانیشی زۆر ئاسانە.




وێنەی ژمارە (٢)

## چۆنیەتی بەکارهێنانی:

١- سیدی نەشتەر گەریەکە دەخەینە سەر کۆمپیوتەر

٢- بەرنامەکە دەکەینەوە دوو ئاراستە دیار دەکەوێت یەکیان (I ACCEPT) ئەویتریان (I ACCEPT) CANCEL هەڵدەبژێرین بەم شێوەیە: وێنەی ژمارە (٢).

پاشان لەرێگەی FILE لەوە دەچینە OPEN DICOMDIR کلیکی لەسەردەکەین و چوار یاخود پێنج فایل دیاردەکەوێت یەک یەک ئەم فایلانە OPEN دەکەین دەبینین یەکێکیان بەشێوەی ڤیدیۆ کاردەکات بەم شێوەیە: وێنەی ژمارە (٣).




وێنەی ژمارە (٣)

# گۆڕینی فایلەکانی OFFICE بۆ PDF

ئا: هەندرێن فەلاح



وێنەی (١)



وێنەی (٢)



وێنەی (٣)



وێنەی (٤)



وێنەی (٥)



وێنەی (٦)

بۆ دروست کردنی فایلی جۆری PDF لەسەرەتاوە دەبێ بەرنامەی CRAET PDF مان هەبێ لەسەر کۆمپیتەرەکە بۆ ئەوەی PDF مان بۆ دروست بکات لەپاش دانانی بەرنامەکە لە فۆلدەری چاپ (PRINT) زیاد دەبێت بەناوی ADOBE PDF وەک وێنەی (٢).

لەپاشان ئەگەر نوسینێکمان هەبوو وویستمان بیکەینە PDF ئەوا دەچینە سەر بەرنامەی WORD لەپاشان دەچینە سەر FILE و PRINT کلیک دەکەین وێنەی (٣).

لە هەڵبژاردنی PRINT دەچینە سەر ADOBE PDF و کلیک دەکەین، وەک وێنەی (٤).

لەکۆتاییدا OK دەکەین و بەناوێک خەزنی دەکەین لەو شوێنەی کە دەمانەوێ بۆ مان دروست دەکات، وەک وێنەی (٥)

وە لەپاش تەواو بوون دەیکەینەوە وێنەی (٦).

## سوودەکانی PDF

١- بۆ ناردنی بۆ ئەنتەرنێت قەبارەکەی زۆر بچووکە.

٢- بۆ هەڵگرتن و دەست کاری نەکردن واتا پارستنی لە ناوچوونی.

٣- بۆ فەرزی رەنگینی لەچاپخانەی رەنگی بەکاردێت.



# کوژانەوەی کۆمپیوتەر پاش ٦٠ چرکە

وەرگێڕانی لە عەرەبییەوە
نبیل عبدالرزاق

یەکێک لە گرفتەکانی کۆمپیوتەر، ئەم گرفتەش پەنجەریەک دەردەچێت کەوا پاش ٦٠ چرکە کۆمپیوتەرەکەت دادەخات و هیچ ڕێگایەکی ترت پێ نادات. یەکەم جار پێویستە دژە ڤایرۆسی نوێ بەکاربهێنی بۆ لەناو بردنی ڤایرۆسەکانی ناو کۆمپیوتەرەکەت، لەبەر ئەوەی هەندێک ڤایرۆس هەن دەبنە هۆی دروست بوونی ئەم گرفتە، بۆ نموونە یەکێک لەم ڤایرۆسانەی خوارەوە:

W32.BLASTER.WORM

W32.SASSER.WORM

BACKDOOR.IRC.CIREBOT

W32.HLLW.LOVGATE@MM

W32.NIMOS.WORM

پاش ئەوەی گومان لە بوونی ئەم ڤایرۆسانە نەبوو، ئەوە هۆکارەکە دەگەڕێتەوە بۆ:

ویندۆز NT، 2000، XP ڕێگا بە دزەکان و هاکەرەکان دەدات بێنە ژوورەوە لە ڕێگەی پۆرتە لاوازەکان و نەپارێزراوەکان و تایبەت بە خزمەت گوزاری REMOTE PROCEDURE CALL، لە کاتی هەوڵدان بۆ هاتنە ژوورەوە، فایلی LSASS. EXE تایبەت بەم خزمەت گوزاریە تێک دەچێت، بۆیە فایلەکە ئەم فەرمانەی کوژاندنەوەی کۆمپیوتەر ئەنجام دەدات، چونکە بەرنامە ڕێژ کراوە (برمجە) بۆ ئەم کردارە، بۆ نەهێشتنی ئەم گرفتە ئەم هەنگاوانە ئەنجام بدە:

یەکەم/ وا دابنێ ئەم گرفتە لە پۆرتەکانە، دەبێ دەست بەجێ هێڵی ئەنتەرنێت بپچڕێنی، دەبێ هەموو پەیوەندیەکان ڕابگری کەوا لەڕێگای ئەم پۆرتانەوە دێن (١٣٥، ١٣٧، ١٣٩، ٤٤٥، ٥٩٣)، ئەوەش لە ڕێگای بەرنامەی FIREWALL یان ڕاستەوخۆ بە بەکارهێنانی FIREWALLی پاشکۆی ویندوز بەم شێوەیە:

START پاشان CONTROL PANEL دوای NETWORK CONNECTIONS پاشان دەست نیشانی ئەم پەیوەندیە بکەی کەوا پشتی پێ دەبەستی، .PROPERTIES




Run

Type the name of a program, folder, document, or Internet resource, and Windows will open it for you.

Open: Shutdown –a

OK Cancel Browse...

ADVANCE. FIREWALL. OK

بەوێنــە روون بکرێتــەوە، وێنەی فایر وول

دووەم/ بەکارهێنانــی START. RUN پاشــان ئەم شــێوازە ووشــەیە بنووسە (SHUTDOWN –A) وەکــو لــە وێنەکــەدا دیارە:

وێنــەی RUN کرابێتــەوە ئەم وشــەیە بنووسری.

ســێیەم/ چارەســەری ئامادەکــراو راســتەوخۆ لە کۆمپانیای مایکرۆسۆفت لەرێــگای ئەنتەرنێــت دابەزێنــە بــەم ناونیشانە:

HTTP://SUPPORT.MICROSOFT.COM/?KBID=823980

HTTP://SUPPORT.MICROSOFT.COM/?KBID=824146 OR

بۆ ئەوەی تووشــی ئــەم گرفتە نەبێت فایروول بەکاربهێنە.

جگە لەم سێ رێگایە، رێگایەکی تریش هەیــە، بــەڵام هەرچەنــد بکــری بەکاری نەهێنی، ئەویش:

لــە ســەر START کلیک بکــە، فەرمانی RUN هەڵبژێــرە، ئــەم دەســتەواژەیە بنووســە SERVICES.MSC پاشــان OK دابگرە، وەکو لە وێنەکەدا دیارە.

وێنــەی رەن ئــەم دەســتەواژەیە نووسرابێت.

لەخزمــەت گــوزاری REMOTE PROCEDURE CALL SERVICE دەگەرێیــن، دووجار کلیکی لەســەر بکە. لە لیســتی RECOVERY چەند فەرمانێکی دەبینیــن، RESTART THE COMPUTER گشــتیان بگــۆرە بــۆ RESTART THE SERVICE پاشان OK.

# خێراکردنی XP

فەیسەڵ مەعروف




وێنەی ژمارە (١)

یەکەم:

١- کلیک لە سەر کات ژمێری ژێرەوە بکە.

٢- دوای کات ژمێرەکە دەکرێتەوە (INTERNET TIME) هەڵبژێرە.

٣- نیشانەی نێو چوار گۆشەی (AUOMATICALLY SYNCHRINIZE WITH AN INTERNET TIME SERVER) لابیە، وێنەی (١)

دووەم:

خۆ ڕزگار کردن لە شێوەی گشتی XP (واتە لابردنی ستایلی XP گەڕانەوە بۆ ستایلی ویندۆزی ٩٨ و میلینۆم و ٢٠٠٠).

١- کلیکی ڕاستە لەسەر MY COMPUTER بکەو برۆ سەر PROPERTIES.

٢- لە سەر ADVANCED کلیک بکە. وێنەی (٢)

٣- SETTINGS هەڵبژێرەو کلیک لە هەڵبژاردەی سێیەم بکە. (وێنەی ٣)

٤- هەڵبژاردەی (٣) ی ئەکتیڤ بکە. وێنەی (٤)

سێیەم:

١- لە لیستی (START) فەرمانی (RUN) (تشغیل) هەڵبژێرە.

٢- لە (RUN) ئەمە بنووسە (REGEDIT) و پاشان لیستی ڕیجیستر (REGISTRY EDITOR) دێتە سەر شاشە.

٣- دەبل کلیک لە سەر (HKEY-CURRENT-USER) بکە تا چەند لقێکی لێ دەبێتەوە.

٤- دەبل کلیک لە سەر (CONTROL PANEL) و پاشان کلیک لە سەر (DESKTOP) بکە.

٥- لیستێکی تایبەت بە (DESKTOP) لە لای چەپە دەبینی، کلیکی ڕاستە لە سەر (DESKTOP) بکە و لیستێکی ترت بۆ دەکرێتەوە کلیک لە سەر (NEW) بکەو




وێنەی ژمارە (٢)

۳- پاشان لیستێک بەم بەرنامانەی کە لە سەرەتایی کار پێکردنی کۆمپیوتەر کار دەکەن بۆ ت دەکرێتەوە،هەر بەرنامەیەک کە دەتەوێت لە سەرەتای کار پێکردن کار نەکات ئەوا نیشانەی بەرامبەر بەرنامەکە لاببە.

پێنجەم:

۱- کلیک بکە لەسەر MY COMPUTER و پاشان برۆسەر درایڤی (C) وفۆلدەری WINDOWS بکەوە، دواتر (TEMPORARY INTERNET FILES) بکەوە هەموو فایلەکان ناو ئەم فۆلدەرە سلێکت بکە و دواتر DELETE کلیک بکە بۆ ئەوەی بسڕینەوە.

۲- کلیکی راستە لەسەر روبەری شاشەبکەPROPERTIES هەڵبژێرە وبرۆ سەر APPEARNCE کلیک بکەو دواتر لە سەر EFFECTS کلیک بکە. وێنەی (٥)

۳- نیشانەی نێو چوار گۆشەی بەردەم USE THE FOLLOWING TRANSITION EFFECT FOR MENUS AND TOOLTIPS لاببەو پاشان OK بکە..

شەشەم:

۱- کلیکی راستە لە سەر روبەری شاشە بکەPROPERTIES هەڵبژێرەو برۆ




وێنەی ژمارە (۳)

وە لەلیستی (NEW) (STRING VALUE) هەڵبژێرە.

٦- فایلی نوێت بۆ دەکرێتەوە دووبارە ناوی لێبنێ بە ناوی بەم شێوەیە (MENUSHOWDELAY) ناوەکە ئەنووسیت.

۷- پاش گۆرینی ناو فایلەکە، کلیکی راستەی لە سەر بکەو (MODIFY) هەڵبژێرە، چوار گۆشەیەکی بچووک دەردەچێت بەم ناوە (EDIT STRING) تیایدا ژمارە (سفر) بنووسە.

۸.کۆمپیوتەرەکەت ریستارت بکەوە، هەست بە خێرایی کردنەوی بەرنامەکان فایلەکان دەکەیت.

چوارەم:

۱- لە لیستی (START) فەرمانی (RUN) (تشغیل) هەڵبژێرە، وە ئەمە بنووسە(MSCONFIG).

۲- پەنجەرەیەکت بۆ دەکرێتەوە و (START UP) هەڵبژێرە.




وێنەی ژمارە (٤)

سەر SETTING کلیک بکە·وێنەی (٥)
٢- COLOR QULITY بکە (MEDDIM 16 BIT) ئەمەیان باشترە بۆ زۆربەی بەکارهێنەرانی کۆمپیوتەر، تەنها بۆ ئەوانە نەبێت لە بواری وێنەو گرافیک کار دەکەن وێنەی (٦)·

حەوتەم:

١- کلیک بکە لەسەر MY COMPUTER و پاشان بڕۆسەر PROPERTIES0

٢- لە سەرADVANCED کلیک بکە دواتر کلکیک بکە لە سەر SETTINGS0 وێنەی (٣)

٣- لە سەرADVANCED کلیک بکە دواتر کلکیک بکە لە سەرCHANGE وێنەی(٧).

٤-وێنەی (٨) ·

٥- کۆمپیوتەرەکە ریستارت بکەوە·




وێنەی ژمارە (٥)




وێنەی ژمارە (٧)




وێنەی ژمارە (٦)

# دانانی ووشەی نهێنی لە ویندۆز ئێکسپی دا(Xp)

ئا: دڵدار کامەران




وێنەی (١)

زۆرجار وا پێویست دەکات کە ووشەی نهێنی دابنێین بۆ کۆمپیوتەرەکەمان بەڵام لە کوێ دا، لەوانەیە دانانی ووشەی نهێنی لە بایۆس زۆر گونجاو نەبێت لەبەر ئەوەی ئەگەر ئەم ووشەی نهێنیمان لەبیر بچێت ئەوا لابردنی کارێکی وا ئاسان نیە،یاخود لەناو ویندۆز دەتوانرێت ووشەی نهێنی هەر یوسەرێک لاببرێت بێ ئەوەی ووشەی نهێنیەکەی بزانرێت، لەبەر ئەوە لە ویندۆز ئێکس پی دا دەتوانین هەستین بە دانانی ووشەی نهێنی بۆ کۆمپیوتەرەکەمان بەجۆرێک کە تاوەکو ووشەی نهێنی نەدرێتێ ئەوا کۆمپیوتەرەکەمان نەچێتە ناو ویندۆز، ئەمەش بە بەکارهێنانی فەرمانی (SYSKEY) ئەویش بەم شێوەی خوارەوە:

١- کلیک دەکەین لەسەر (START) پاشان لەسەر(RUN).

٢- لە ناو(RUN) دا دەنووسین (SYSKEY) بروانە وێنەی (١).

٣- بۆکسیمان بۆ دەبێتەوە بەم شێوەی خوارەوە،وەک وێنەی (٢).

٣- پاشان کلیک لەسەر (UPDATE)




وێنەی (٢)




وێنەی (٣)

دەکەین بۆکسێکی ترمان پیشاندەدات، بروانە وێنەی (۳).

٤- پاشان کلیک لەسەر (PASSWORD STARTUP) دەکەین لە شوێنی(PASSWORD) ووشەی نهێنیەکە دەنووسین وەلە شوێنی (CONFIRM) ووشەی نهێنیەکە دووبارە دەنووسینەوە،وە پاشان کلیک لە سەر (OK) دەکەین.

٥. پاشان کۆمپیوتەرەکەت ریستارت بکە، دەبینت کە پێش چوونە ناو ویندۆز داوای پاسۆردەکە دەکات، بروانە وێنەی (٤).

٦- بۆ لابردنی ووشەی نهێنی هەمان هەنگاوەکانی پێشوتر دووبارە دەکەینەوە بەلام ئەمجارە دەچینە سەر بەشی (SYSTEM GENERATED PASSWORD) ئینجا کلیک لەسەر ( LOCALLY STORE STARTUP KEY) دەکەین وە دواتر کلیک لەسەر (OK) دەکەین دەبینن کە بۆکسێکمان پی نیشان دەدات کە داوای ووشەی نهێنی پێشتر دەکات کە دانراوە بۆ ئەوەی پاسۆردەکە لاببات، بروانە وێنەی (٥).



وێنەی (٤)



وێنەی (٥)

## ئاگاداری

داوا لە هەموو ئەو خوێنەرە بەڕێزانە دەکەین کە هەر پێشنیارێک یان هەر تێبینێک یان هەر رەخنەیێکیان هەبوو یان هەر کەم و کورێکیان لە گۆڤارەکە بە دی کرد با ئاگادارمان بکاتەوە بەم ناونیشانە : هەرێمی کوردستانی عێراق / یەکەی کۆمپیوتەر لە دیوانی وەزارەتی رۆشنبیری لە هەولێر جادەی شەست مەتری نزیک هۆلی زەرد ژمارە تەلەفونی ۲۲۳۲۷۲۱ مۆبایل ۰۷٥۰٤٦۱۸۰٤٥ یان پۆستی ئەلکترۆنی.

Email : computer_magazine_2005@yahoo.com
Email : aras_co_center@yahoo.com
Email : aras_aaa@hotmail.com




# سڕینەوەی ئۆتۆماتیکی فایلەکانی ناو Recyclebin

ئامادەکردنی: وشیار نوەرەدین

هەروەک دەزانن کاتێک کە فایلێک (DELETE) دەکەن و دەیخەنە ناو سەلەی زبل (RECYCLE BIN) پێویستە بۆ بە تاڵ کردنی سەلەکە دیسان بگەڕێنەوە سەر سەلەکە و ئینجا بە داگرتنی کلیکی ڕاست و هەڵبژاردنی (EMPTY RECYCLE BIN) سەلەکە بەتاڵ بکەن.

بەڵام ئەگەر ئەم ڕێگایە بەکار بێنن دەتوانن کارێک بکەن کە کاتێک فایلێک دەسڕنەوە یان DELETE دەکەن پێویستی بەوە نەبێت کە بۆ بەتاڵ کردنی سەلەکە دووبارە بۆ RECYCLE BIN بگەڕێنەوە و بە شێوەیەکی ئۆتۆماتیکی فایلی DELETE کراو لە سەلەدا بەتاڵ دەکرێت . بۆ ئەم کارەش هەنگاوەکانی خوارەوە جێ بە جێ بکە :

١- لە سەر ئایکۆنی سەلەی زبل (RECYCLE BIN) کلیکی ڕاست بکە .

٢- (PROPERTIES) هەڵبژێرە .

پەنجەرەیەک دەکرێتەوە وەک وێنەی ژمارە (١).

٣- لەو پەنجەرەیەدا (GLOBAL) هەڵبژێرە.

٤- لە چوار گۆشەی تەنیشتی نوسراوی (DO NOT MOVE FILES TO THE RECYCLE BIN REMOVE FILE IMMEDIATELY UPON DELETE) نیشانەی ڕاست دابێ .

٥- APPLY هەڵبژێرە و ئینجا OK دابگرە .

بەم جۆرە ئەو فایلانەی کە (DELETE) دەکەی ڕاستەوخۆ لە سەلەی زبل دەسڕێتەوە بەڵام ئەم کارە گرفتێکیش دروست دەکات ئەویش ئەوەیە کە تۆ چیتر ناتوانی فایلەکانی ناو سەلەی زبل دووبارە (RESTORE) بکەی یان دوبارە لە سەلەی زبل بیانگەڕێنییەوە بۆ ناو دۆسییەکانتدا .



# دانانی کیبۆرد لەسەر ڕوپەڕی شاشە

ئا: محەمەد سلێمان



وێنەی (١)

کاتێک لە ناکاو کیبۆردەکەت دەوستێت و چەند کارێکی پێویست و خێرات هەیە یان لە بەر هۆیەک بێت کیبۆردەکەت کار ناکات و دەتەوێت هەندێک فەرمان بە کیبۆرد بە جێبگەیەنیت یان دەقێکی بچوک و کاتی بنوسیت تا ئەو کاتەی کیبۆردەکەت چاک دەکەیتەوە ئەوا دەتوانین بەرێگایەک لە ڕێگای ماوسەوە کار لە سەر کیبۆرد بکەین و بتوانین بۆ ماوەیەک بەسەر ئەم کیشەیە زاڵ بین لە ژمارەی پێشودا باسی وەستانی ماوسمان کرد بۆ ئەوەی ئەم کارە جێبەجێ بکەین لە (START) دەست پێدەکین و لەویشەوە لیستی بەرنامەکانە (PROGRAMS) دواتریش دەچینە سەر (ACCESSORIES) ڕاستەوخۆ بۆ (ACCESSIBILITY) لە وێش کلیک لەسەر (.ON-SCREEN KEYBOARD LINK) دەکەین وەک لە وێنەی ژمارە (١) ڕونە، دواتر لەکاتی کردنەوەی پەرەیەکی نوسیندا دێتە سەر ڕوپەڕی شاشەکە دەتوانیت بەکلیک کردن لەسەرهەرکامە پیت بێت دەتوانیت لەسەرپەرەکە بنوسیت بروانە وێنەیەکی تاقیکاری ژمارە (٢) بەم شێوەیە دەتوانین بەسەر ئەم کارەدا سەرکەوین . جگە لەمەش دەتوانین لە فەرمانی SETTING بە ئارەزوی خۆمان فۆنتەکە بگۆرین وە ڕاستەوخۆش کیبۆردەکە دەبێت بەم فۆنتە.



وێنەی (٢)

# گـۆڕینی شـێوەی بۆکـسی کوژانەوەی ویندۆز (Xp)

ئا:ڕێبین ڕەمزی بالیسانی




وێنەی ژمارە (١)

ویندۆز ئێکسـپی لەگەڵ ویندۆزەکانی تـر زۆر جیـاوازە لـە ڕووی ڕەنـگ و سـیمس و سـتایلەوە یەکێـک لـەم جیاوازیانە ئەوەیە کە دەبینین کە شێوەی بۆکسـی کوژانـەوەی ویندۆز ئێکسـپی وەک ویندۆزەکانـی پێشـوتر نیـە بەڵکو شـێوەیەکی ترە، لەم ویندۆزەدا دەتوانین بۆکسـی کوژانەوە بگۆرین بۆ شـێوەی وینـدۆز (ME) یاخـود (٢٠٠٠) ئەویش بە کردنی ئەم هەنگاوانە:

١- کلیـک دەکەیـن لەسـەر(START) وەپاشان (SETTINGS) دواتر (CONTROL PANEL)، وێنەی(١).

٢- دەبڵ کلیک دەکەین لەسەر ئایکونی (USER ACCOUNTS)، وێنەی(٢)

٣- پاشان کلیک لەسەر (CHANGE THE WAY USER LOG ON OR OF ) دەکەیـن،




وێنەی ژمارە (٢)




وێنەی ژمارە (٣)




وێنەی ژمارە (٤)

وێنەی (٣).

٤- هێمای (√) لە تەنیشت (USE THE WELCOME SCREEN) لادەبین ئەویش بە کردنی کلیک لە تەنیشت چوارگۆشە بچوکەکە،وە پاشان کلیک لەسەر (APPLY OPTIONS) بکە وەک وێنەی (٤) .

٥- کلیک لەسەر (START) ئینجا (TURN OF COMPUTER) بکە دەبینیت کە شێوەکەی گۆڕاوە وەک وێنەی (٥).




وێنەی ژمارە (٥)

# زانیاریەکی گرنگ لەبەرنامەی (نیرۆدا)




وێنەی (١)

ئا: هاوکار رەحمان

بەرنامەیەکە زۆر بەمان دەزانین بەکاری بێنین کە بەتایبەتی ئەو کەسانەی کەکاری کۆپی کردن دەکەن، ئەم زانیاریە بریتیە لەوەی کەکاتێک گۆرانیەکی دەنگی چاک دەکەین یاخود هەڵبژاردەیەکی دەنگ دروست دەکەین لەپاشان کۆپی دەکەین دەبینین لەنێوان تراکێک بۆ تراکێکی تر پچرانەک هەیە بەرنامەی نیرۆ ئەم گرفتانەمان زۆر بەئاسانی چاک دەکات هەردوو نێوانی تراکەکان پێکەوە دەبەستێتەوە تەنها ژمارەیکیان دەگۆرێ.

لەپاش کرنەوەی بەرنامەکە دەچینە سەر (MAKE AUDIO CD) کلیک دەکەین وەک وێنەی (٢).

پاش ئەوەی تراکە دەنگیەکان لەناو خانەکەدا دادنێین لەلای دەستە راستەوە دوو خانەی بەتاڵ هەیە ئەگەر هەردوو خانەکە پربکەینەوە نێوان تراک ناپچرێت بەڵکو پێکەوەی دەبەستێت، لەپاشان سیدیەکە کۆپی دەکەین . وەک وێنەی (٣).




وێنەی (٣)




وێنەی (٢)

# دانانی ووشەی نهێنی بۆ فایلەکانی وۆرد



وێنەی ژمارە (١)

نا: کاروان کرمانج

مایکرۆسۆفت وۆرد بە تەواوی ئەو تایبەتمەندیەی کە هەیەتی توانیویەتی سودێکی یەکجار زۆر بگەیەنێتە بەکارهێنەرانی ئەم بەرنامەیە، لە ڕێگای ئەم بەرنامەیەدا دەتوانرێت چەندان کاری ناو فەرمانگەکان و ڕۆژنامەکان و خەڵکی تایبەتیش بتوانێت سود وەرگرێت زۆربەی ئەم تایبتمەندیەش بۆ ئاسانی بەکارهێنان و زوو فێربونیەتی بەمەش دەتوانرێت زۆرترین کەس بەکاری بێنێت بۆیەش ئێستا بەهێزترین بەرنامەیە لە بەکارهێنانیدا لە سەرتانسەری جیهاندا، یەکێک لە تایبەتمەندیە کانی ئەم بەرنامەیە دانانی وشەی تێپەربونە (PASSWORD) لەسەر فایلەکانی وۆردا .
بۆ بابەتە گرنگ و زانیاریە تایبەتیەکانی ناو کۆمپیوتەرەکەت یان بۆ ئەوەی ئەو زانیاریانە پارێزراو بن لە دەست تێکدان و شێواندنی نەخشەو شێوازی نوسینەکەت، دڵنیا بون لە وەی کە جگە لە خۆت کەسی تر ناتوانێت دەستکاری بابەتی و زانیاریەکانی تۆ بکات ئەوا بۆ ئەم کارە دێین وشەی نهێنی تایبەت بە خۆمان لەسەر ئەو فایلانە دادەنێین و لای خۆمان هەڵیدەگرین وە بەم کردارە کەس ناتوانێت ئەم فایلانە بکاتەوە جگە لە خۆت، هەنگاوەکان سانان و بە هێمنی جێبەجێیان بکە بڕوانە ئەم کردارانە :
لەسەرەتادا فایلێکی وۆردمان هەیە خەزنکراوە بە ناوێکەوە بۆ ئەوەی وشەی نهێنی بۆ دابنێین دەچینە سەر هەڵبژاردەی (TOOL) لە لیستی هەڵبژاردەکان لەوێ (OPTIONS) هەڵدەبژێرین بڕوانە وێنەی ژمارە (١) دواتر بۆکسێک دەکرێتە ئێمە کلیک لەسەر (SECURITY) دەکەین وەک لەوێنەی (٢) دیارە، لە شوێنی نوسینی پاسوۆردا ژمارەی نهێنی تایبەت بە خۆت دەنوسی لە هەردوو خانەدا ئینجا کلیک لەسەر (DIGITAL SIGNATURES) دەکەین لەوێنەی (٢) دیارە دواتر چوارگۆشەیەکی تر دەکرێتەوە، لە مەیان داوای دانانی ئەو فایلەت لێدەکات کە دەتەوێ پاس وۆردێکی بۆ دابنێیت کلیک لەسەر (ADD) دەکین و دوایی چوارگۆشەیەکی تر دەکرێتەوە لە وێ دەست نیشانی فایلەکەمان دەکەین و کلیک لە سەر (SAVE) دەکەین بڕوانە



وێنەی ژمارە (٢)




وێنەی ژمارە (٣)

وێنەی ژمارە (٤) دواتر کلیک لە سەر OK دەکەین دوبارە کلیک لەسەر OK دەکەین بەڵام ئەم جارەیان داوای نوسینی پاسوۆردمان لێدەکات ئێمەش ئەو پاسوۆردە دەنوسین کە لەسەرەتا نوسیمان دوایی کلیک لەسەر OK دەکەین دوبارە داوای پاسوۆرد دەکات ئەمجارەشیان دەنوسینەوە کلیک لەسەر OK دەکەین دواتر هەموو ئەم دەستکاری کردنە سەیڤ دەکەین، ئەگەرنا کردارەکە سەر ناگرێت، وە لەکاتی کردنەوەی فایلە کە دوجار داوای نوسینی پاسوۆرد دەکات و دەچێتە ناو فایلەکەوە بڕوانە وێنەی ژمارە (٥) . بەڵام ناتوانێت فایلەکانت لە مەترسی سڕینەوە بپارێزێت چونکە دەتوانێت وەک هەر فایلێکی تر بسڕیتەوە. ئەبێ لەم تێبینیە ئاگادار بین.



وێنەی ژمارە (٤)



وێنەی ژمارە (٥)





# کتێبخانەی کوردی لە پەراوێزی کتێبخانە ئەلیکترۆنیەکاندا

**ڕیپۆرتاژ و فۆتۆ: ڕێناز ئەردەلان بەکر**

گومان لەوە دانیە لەو سەردەمەی ئێستایی گلۆبال و ئەنتەرنێت و ئەم پێشکەوتنەیی تەکنەلۆژیا بەخۆیەوەی دیوە، توانراوە گۆڕانکاری و سودێکی تەواو لەزۆربەیی بوارەکانی ژیانی ئەم سەردەمە بەدی بکری · بواری کتێبخانەش یەکێکە لەم بوارانەی کە بەهۆیی ئەم پێشکەوتنەی تەکنەلۆژیا وە گۆڕانکاریەکی بەرچاوی تێدا بەدی دەکرێ لەوولاتە پێشکەوتوەکان، بەلام ئایا ئەم جۆرە گۆڕانکاریە لەکتێبخانەکانی کوردی بەدی دەکرێ ؟ ئایا توانراوە تاکو ئێستا هەولی دامەزراندنی کتێبخانەیەکی ئەلیکترۆنی بدرێ لەکوردستان ؟ یاخود پرۆژەیەک لە بەر دەست دا هەیە بۆبنیاد نانی کارێک کە کتێبخانەکانی کوردی لەم بوارە کلاسیکیەیی بگۆڕێ بۆ سیمایەکی تری پێشکەوتوو ؟ ئایا حکومەتی هەرێم هیچ کار ئاسانیەکی کردوە بۆئەم مەبەستە؟ بۆزانین ڕویی پرسیارمان ئاراستەی چەند بەرێزێک کرد کە بەم شێوەیە هاتنە دوان.



**سەرەتا بەرێز د· محەمەد مصطفی دزەیی بەڕێوەبەری گشتی کتێبخانەیی ناوەندی سەر بەزانکۆیی صەلاحەدین بەم شێوەیە تیشکی خستە سەر ووتەکانی:**

کتێبخانەی ئێمە بەباشترین کتێبخانە دادەنرێ لەکوردستان حکومەتی هەرێمی کوردستان بایەخێکی زۆر بەم کتێبخانەیە دەدات بەتایبەتی سەرۆکایەتی زانکۆیی صەلاحەدین وەرگرتنی کتێب لێرە بەمیکانیزمێکی کلاسیکە تائێستا قوتابیان و مامۆستایان بەهۆیی کارتەوە ئەگەر سەرچاوەیان بوێ بەدەستیان دەکەوێ ئەم کارتانەش بەهۆیی زۆری بەکارهێنانیانەوە زۆر کۆن بوون ·لەم کتێبخانە گەورەیی ئێمە دوو پسپۆڕی پۆلین هەیە بەلام بەهاوکاری لەگەل فەرمانبەرانی تر دەتوانین ڕۆژانە کارەکان بەجێ بگەیەنین،ئێمە بۆ ماوەی دوومانگ دەبێ دەستمان بە جەرد کردنی کتێبەکانمان کرد، ئەم جەردەش بۆ ئەوە بوو بۆ ئەوەی خۆمان ئامادە بکەین کە

کتێبخانەکەمان بکەین بە کتێبخانەیەکی ئەلیکترۆنی. بەڕێز سەرۆکی زانکۆ چاوی بەشاندێکی ئێرانی کەوت بەرنامەیەکیان هەبوو کەپێشنیاریان کرد ئەویش ئەوە بوو کەلەجیاتی ئەوەی قوتابیان و مامۆستایان بەهۆیی کارت بگەڕێن لەکتێب کەزۆر جار ناشی دۆزنەوە بەهۆیی سیستەمی کۆمپیوتەرەوە بەکاری بهێنن، ئێمە نووسراوێکمان ئاراستەی سەرۆکایەتی زانکۆ کرد سەرۆکایەتی زانکۆلە سەری ڕازی بوون، ئێستا نوسراوەکە لە دارایی یە کەهیواداریین دارایی ڕازی بێت لەسەر کڕینی ئەم بەرنامەیە، کەنرخەکەیی (٢٠) هەزار دۆلارە کە ئەگەر هاتو ئەم پارەیە لەگەڵ ئەو بەرنامانەی کەلە جیهاندا هەیە بەراورد بکەین نرخێکی گونجاوە زۆر نیە، ئێرانیەکان بڕیاریان داوە کەچەند پسپۆڕێک بنێرن بۆ کردنەوەی خول لەم بارەیەوە بۆ ئەوەی کادیرانی خۆمان شارەزایی پەیدا بکەن. کەیی ئەم پڕۆگرامە دەست بەکار بوو ئێمە هەوڵ دەدەین بەهۆیی چەند تۆڕێک جا تۆڕی تیشکی بێت یاخود کێبڵ بێت یاخود هەوایی بێت کتێبخانەی ناوەندی بە کتێبخانەی کۆلێژەکان ببەستینەوە، بۆ ئەوەی قوتابیان لەکۆلیژی خۆیان بەدوایی سەرچاوەدا بگەڕێن، لێرە بەئاسانی کتێبەکەیان لا دەست بکەوێت. زۆر هەوڵی تر لەئارادایە بۆ بەرەو پێشخستنی ئەم کتێبخانەیە، لەوانە ئێمە لێرەدا زیاتر لە (٥٠٠) دەست نوسمان هەیە کەبەنرخترین کتێب دادەنرێن لە عێراقدا ئەو دەست نوسانە زۆر کۆنن هەندێکیان لەگەڵ کردنەوەی توشی دڕان هاتوون لەبەر ئەوە ئێمە هەوڵمانداوە ئەم دەست نوسانە بخەینە سەر (سی دی) بۆئەوەی بەئاسانی لەلایەن خوێنەر کەپێویستی پێیەتی بەکار بێت.



**بەڕێز ئازاد عبدلعەزیز محەمەد بەرپرسی بەشی ئەتروحات لە کتێبخانەی ناوەندی دەڵێت :**

کتێبخانەی ئەلیکترۆنی زۆر پێویستە بەتایبەتی لەم سەردەمەی ئێستا کەتەکنەلۆژیا لەڕادەبەدەر پێشکەوتووە، باوی ئەوە نەماوە قوتابیان و مامۆستایان بەهۆی کارتەوە لە سەرچاوەو کتێب بگەڕێن ئەگەر بێت و ئەلیکترۆنی بێت لەڕێگایی ڕەقەمەکەو ناوەکەوە بەشێوەیەکی ئاسان و زۆر بەخێرایی بەدەستیان دەکەوێ، خەتی ئەنتەرنێت زۆر پێویستە بەتایبەتی بۆ قوتابیانی زانکۆ کە بۆ توێژینەوەی دەرچون وەک سەرچاوە پشت بەئەنتەر نێت دەبەستێت.

**ئەحمەد حەمەد ئەمین قوتابی خوێندنی باڵا بەم شێوەیە هاتە دوان:**

سەبارەت بە کتێبخانەی ئەلیکترۆنی زۆر پێویستە بۆئەمڕۆو توێژی قوتابیانی زانکۆ بۆئەوەی بتوانن بەزوترین کات بگەن بەوسەرچاوەو کتێبانەی کە پێویستیان پێیەتی. بەتایبەتی لەڕویی توێژینەوە قوتابی پێویستی زۆری پێیەتی، لێرەشدا گرفت هەیە بۆنمونە قوتابیان بەهۆی نەبونی مەکتەباتی ئەلیکترۆنی زۆرجار لەوانەیە قوتابی دەرامەتی ئەوەی نەبێ لەسەنتەرەکانی دەرەوە ئەنتەرنێت بەکاربهێنێ،لای خۆمان ئەگەر بکرێتەوە هەم لەڕویی مۆدێرنەوە شتێکی نوێ بابەتە هەم لەڕوی بابەتیەوە بۆ قوتابیان بەسودە. ئێمەش وەک قوتابیانی خوێندنی باڵا کێشەمان زۆرە بۆنمونە من بەمانگ بەهەفتە گەڕاوم لەدوای سەرچاوە بەهۆیی ئەوەی کارتەکان فەوتاون بەدەستم نەکەوتوە بۆیە ئەگەر بکرێتە سیستەمی کۆمپیوتەر بەئاسانی سەرچاوە بەدەست دەکەوێ، فەرمانبەرانی ئێرە کەم تەرخەم نین بەڵام لەڕوی ئیدارەوە کەم تەرخەمن.ئیتر ئەگەر بمانەوێ ئەم کتێبخانەیە دابمەزرێ باپەیوەندیمان لەگەڵ کتێبخانە دوەلیەکان هەبێ بۆیە هیواداریین سەرۆکایەتی زانکۆی سەلاحەدین بەم کارە هەڵبستێ بۆئەوەی بتوانین خزمەت بەتوێژی قوتابیان و مامۆستایانی زانکۆ بکەن بۆ ئەوەی ئەوانیش بتوانن لەئاستی زانستی بەردێکی تر بخەنە سەر بناغەیی بزافی ڕزگاری خوازی کوردستان لەڕووی ڕۆشنبیریەوە.

**بەڕێز خاتوو هێرۆ وەیسی بەرپرسی بەشی کۆمپیوتەر گوتی :**

بەبۆچونی من بونی کتێبخانەی





ئەلیکترۆنی زۆر پێویستە هەم بۆیارمەتی دانی قوتابیان کەدێن بۆئێرە لەجیاتی ئەوەی لەڕەفەکان بەدوایی سەرچاوەبگەڕێن بەهۆیی کۆمپیوتەر بێت کەبەئاسانی بۆیان دەدۆزرێتەوە،هەم بۆفەرمانبەران کارئاسانیە ·بۆیە داوادەکەین چەند کۆمپیوتەرێک لە مەمەڕەکان دابنرێ کتێبەکانی تێدا هەڵبگیری دیاریش بکرێ کەکتێبەکان لایی قوتابیانن یاخود لای خۆمانن·بونی تۆڕی ئەنتەرنێت زۆرپێویستە بۆقوتابیان چونکە ئەگەرلایی خۆمان هەبوو ئەوکات قوتابیان پەنا نابەن بۆسەنتەرەکانی دەرەوە چونکە سەنتەرەکانی دەرێ هەم کولفەیی دەوێ هەم دورن لەکولێژەکان کاتێکی زۆری قوتابی بەفیڕۆ دەچێ·



**بەڕێز خاتوو بەیان مەجید بەرپرسی بەشی خواستنی کوردی و عەرەبی لەکتێبخانەی ناوەندی زانکۆ دەڵێت:**

کتێبخانەی ئەلیکترۆنی دەبوایە زووبکرابایەوە نەک ئێستا کۆمپیوتەرێکی زۆر تەرخان بکرێ تۆڕی ئەنتەرنێت هەبێ ·ئێمەلێرە لەم بەشە ژمارەیەکی یەکجار زۆر کتێبمان هەیە مامۆستایان و قوتابیان کەداوایی کتێب دەکەن زۆر بەزەحمەت دەبینرێتەوە،بەڵام

ئەگەر کۆمپیوتەر هەبێ تەنیا لەڕێگایی داخیل کردنی ناونیشانەوە کتێبەکەت دەست دەکەوێ ·



**هەر سەبارەت بەڕۆڵی کتێبخانەی ئەلیکترۆنی بۆبەرەو پێشبردنی پەرتوکخانەکانی کوردستان بەڕێز ئاسۆ حەسەن بەڕێوەبەری کتێبخانەی گشتی هەولێر بەم شێوەیە ئاماژەی بەبۆچونەکانی خۆیی کرد:**

سەبارەت بە کتێبخانەی ئەلیکترونی پێش ساڵێک یەکەم کار کەمن هاتم بیرم لێ کردەوە، ئەوەبوو کەدەست پێ بکەین بەکردنەوەی کتێبخانەیەکی ئەلیکترۆنی. کەئەمەش ڕاستە کارێکی زۆری دەوێ ئاسان نییە، بەڵام کارئاسانیەکی زۆرمان بۆ دەکات و لەگرفتەکان دورمان دەکاتەوە لەهەڵگرتنی کتێب لە پاراستنی کتێب لەزۆر شتی دیکە، ئەمەخاڵێک خاڵێکی دیکە ئەوەیە ئەمرۆسەردەمی خێراییە دەبێ بەزوترین کات سەرچاوەبەدەست بکەوێ،یاخود یەک لەگرفتەکانی ئێمە ئەوەیە کەلاپەڕکانی کتێب لێ دەکەنەوەبەتایبەتی قوتابیانی ناوەندیو ئامادەیی کاتێک کەدێن بۆراپۆرت نوسین زۆرجار ناینوسنەوە بەڵکو لاپەڕەکە لێ دەکەنەوە ·بۆیە بونی کتێبخانەی ئەلیکترۆنی زۆر گرنگە هەبێ،کتێبەکانیش بخرێتە سەر (سی دی) کەدەتوانی لەجیاتی ئەوەی دوهۆڵ لەکتێب هەڵبگری ڕەنگە لەناو دۆلابێک هەڵی بگری · بەڵام دەست پێ کردن بەکتێبخانەی ئەلیکترۆنی کارێکی زۆری دەوێ، بۆنمونە ئێمە لەکتێبخانەی خۆمان دەست پێ بکەین کتێبخانەی ئێمە کەزیاتر لە (٥٠) هەزار کتێبی تێدایە هەڵبەتە تازە ناکرێ ئێمە ئەو کتێبانە لەتوانامان دانیە هەموو بخەینە سەر کۆمپیوتەر بەڵام لەمەودوا ئەگەر بتوانرێ ئەو کتێبانەی کەتا زەدێن هەموو بە(سی دی) چاپ بکرێ· کتێبخانەی ئەلیکترۆنی کۆمەڵێک پێداویستی دەوێ لەوانە چەند کۆمپیوتەرێکی پێویستە چەند پسپۆڕێکی دەوێ پێداویستی هونەری و تەکنیکی دەوێ،ئێمە لێرە تەنیا دوو کارمەند کۆمپیوتەریان دەزانی داواشمان لەوەزارەتی ڕۆشنبیری کرد کەخولێکی



فێربوونی کۆمپیوتەرمان بۆبکاتەوە بەڵام نەکرایەوە،دواجار خۆمان خولمان کردەوە ئەم دوو کارمەندەی خۆمان کرد بەمامۆستا توانیمان ١٠ تا١٥ کارمەندی خۆمان فێرە کۆمپیوتەربکەین، وەک هەنگاوێک لە ئێمەوە بۆ ئەوەی خۆمان ڕزگار بکەین لە کارتی کتێب و لە سجلات و بەدوای کتێب گەڕان، بۆیە ئێمە داواکارین لەوەزارەتی ڕۆشنبیری لیژنەیەک دابنێ، ئەوپەڕی ئیمکانیات بخرێتە ژێر دەست، هەروەها پێویستی بە لیژنەیەکی سەرپەرشتی هەبێ چونکە پێویستی بەخەڵکانێکە کەشارەزایی هەبێ و کاری تێدا کردبێ ٠

**بەرێز خاتوو ڤیان سلێمان بەرپرسی بەشی ئەنتەرنێت لەکتێبخانەی گشتی بەپێ یی بۆچونی خۆیی دەڵێت:**



من پێم چاکە ناوی هەموو کتێبەکان بخرێتە سەر کۆمپیوتەر یاخود بیانخەینە سەر (سی دی ) ناونیشانەکانیشی دیاری بکرێ کە بۆ چ بەشێکە مێژووە یاخود زانستە ٠٠٠٠هتد ٠ کەئەمەش کارئاسانیەکی زۆرمان بۆدەکات ٠ ئێمەلێرە سیستەمی (داتا بەیس) مان هەیە زۆر باشە ئێمە پێشنیارمان کرد بۆ وەزارەتی ڕۆشنبیری کە پارەمان بۆسەرف بکەن بۆکارکردن لەسەر ئەم سیستەمە بەڵام بەداخەوە وەزارەت بۆمانی نەکرد ٠ئەم سیستەمەش ئەوەبوو کاتێک هەر قوتابیەک بێت بەدوایی کتێبێک بگەڕێ ناوی کتێبەکە نەزانێ بەس بزانێ ئی چ بوارێکە ئینتەرێک بکات ژمارەیەک کتێبی بۆدێتە خوار لەسەر شاشەی کۆمپیوتەرەکە، یاخود دەتوانێ بەهۆی تەنیا ناوی نوسەرەکەوە کتێبەکە بدۆزێتەوە ٠ ئێمە هۆڵێکی ئەنتەر نێتمان هەبوو قوتابیان سودێکی زۆریان لێ وەردەگرت

وەک سەرچاوەزۆر پشتیان پێ دەبەست بەتایبەتی بۆ تویژینەوەی دەرچوون، بەڵام ئێستا داخراوە کۆ مپیوتەرەکان هەمووی وەستاون ٠بۆیە ئێمە داواکارین لەوەزارەتی ڕۆشنبیری کە نەسریەکی چاک تەرخان بکات بۆکتێبخانەکەمان بۆ ئەوەی یەکەم شت فهرەستی کتێب نەمێنێ هەمووی ببێت بەکۆمپیوتەر، ئەگەر بکرێ (٨) کۆمپیوتەر دابین بکرێ (٤) بۆ کچان (٤) بۆ کوڕان ئەوکاتە ئێمە کێشەمان نابێ ٠



**بەرێز عبدللە حەسەن بەرپرسی کتێبەکانی کتێبخانەی گشتی گوتی :**

کتێبخانەی ئەلیکترۆنی زۆر جیاوازە لەگەڵ کتێبخانەی ئاسایی ئەمیان ئاسانترە ئێمەلێرە گرفتێکی زۆر دێتە ڕێمان تۆزێکی زۆر لێرە هەیە، لەگەڵ تێپەڕبونی ڕۆژگار کتێبەکان دەڕزێنەوە یان زۆر جارکاتێک کتێب دەبەن نایهێننەوە بۆ یە داواکارین کەوا کار ئاسانی بکەن بۆ کردنەوەی کتێبخانەیەکی ئەلیکترۆنی،داوا لەحکومەتی هەرێم دەکەین کەوا یارمەتیمان بدات بۆ ئەم مەبەستە٠




# لۆگۆس نێت:گەورەترین سایت لەبواری وەرگێڕانی ڕاستەوخۆ

ئا: دیار عزیز حسێن

هاولاتی شیلی (ڕۆدریگۆ فیرگارا)ی تەمەن (٥٤) ساڵ گەورەترین فەرهەنگی ئەلیکترۆنی بەخۆڕایی لەسەر ئەنتەرنێت دانا کەپێک هاتووە لە واتاو وەرگێڕانی چەند ملیۆنێک ووشەی جۆراو جۆر بۆ زیاتر لە(٢٠٠) زمان و زاراوەی جیهانی، (ڕۆدرِیگۆ) لەساڵی (١٩٧٤) لەشیلییەوە کۆچی کرد بۆ ئیتاڵیا ئێستاش لەشاری (مۆدینا)ی ئیتالی دەژی لەساڵی ١٩٧٩ کۆمپانیای (لۆگۆس)ی دامەزراند کە گەورەترین کۆمپانیای جیهانە لەبواری وەرگێڕان، ئەم کۆمپانیایە زیاتر لە (٣٠٠٠) یارمەتیدەر و هاوکاری هەیە لە جیهان کەلەبوارەکانی گەڕان و گفتوگۆی دەنگی بۆوەرگێڕانی ووشەکان کاردەکەن، بەتەنها (٢٠٠) فەرمانبەر لەبارەگای سەرەکی کۆمپانیا لە (مۆدینا)دەست بەکارن، داهاتی ساڵانەی ئەم کۆمپانیایە (لەبواری وەرگێڕان و بڵاوکردنەوە) دەگاتە نزیکەی (٣٠)ملیۆن یورۆ. ○

بەهەمان شێوە پاش بەرفراوان بوونی تۆڕەکانی ئەنتەرنێت لەساڵی (١٩٩٥) ڕۆدرِیگۆ توانی لەڕێگای سایتی (WWW.LOGOS.NET) گەورەترین خزمەت لەبواری وەرگێڕان لە وە بۆ(١٢٦)زمانی جیاجیا پێشکەش بکات کە هەندێ لە ووشەکان تۆماری دەنگی و واتای ڕوونکەرەوەیان لەگەڵدایە، وەهەروەها سایتەکە فەرهەنگێکی منداڵانی پێکهاتوو لە (٣٢٠) ووشەی سەرەکی لەخۆی گرتووە کە ووشەکان وەرگێردراون بۆ (١٣٥) زمانی جیاجیای جیهانی.

سەرچاوە / لۆگۆس نێت

# ڕێگای پێکەوە بەستنی دوو کۆمپیوتەر بەیەکەوە کەلەیەک هێڵی ئینتەرنێت بەشداربن



**کامەران خۆشناو**
khoshnaw76@hotmail.com

سەبارەت بە بەستنی دوو کۆمپیوتەر بەیەکەوە، کە بەشداربن لەیەک هێڵی ئینتەرنێت، ئەو کاتە دەتوانین لەکام کۆمپیوتەر بێت بچینە نێو دەریای فراوانی ئینتەرنێت .

هەنگاوەکانیش بەم جۆرە دەبێت :-

یەکەم :- هەڵسە بە کڕینی دوو کارتی شەبەکە بۆ پێکەوە بەستنی کۆمپیوتەرەکان بەیەکەوە، وەکارتەکان لەسەر هەردوو کۆمپیوتەرەکە چێگیر بکە، وەهەڵسە بە ناساندنی کارتەکان، ئەویش بە هۆی ئەو (CD)یەی کە لەگەڵ کارتەکەدایە بۆ ناساندنی .

دووەم :- هەڵسە بە کڕینی کێبڵی پێکەوە بەستن بەیەکەوە، ئاگاداری ئەوە بە کێبڵەکە دەبێ (CROSS CABLE) بێت، ئەوانی تر بەکەڵک نایەت چونکە یەک سەری هەیە.

سێهەم :- بۆ پێناسە کردنی تۆڕەکە، لەیەکێک لە کۆمپیوتەرەکان ئەم خاڵانە جێ بە جێ بکە .

١-CONTROL PANEL

٢- NETWORK

٣- ADD

٤- PROTOCOL

٥-دوایی لە کۆمپانیاکان (MICROSOFT) دیاری بکە.

٦- لەبەشی بەرامبەر (TCP/IP) دیاری بکە کە ئەمە زۆر گرنگە بۆ بەشداری کردن لە تۆڕی ئینتەرنێت، بەڵام ئەگەر بتەوێ بەشداری لەفایلات بکەیت ئەوا دانانی تر هەیە، دوایی کلیکی APPLY بکە بۆ دانانی پرۆتوکۆڵ، دوایی بڕۆ بۆ TCP/IP تایبەت بەکاری تۆڕ، ئەگەر بپرسیت:- چۆن بیناسم؟

وەڵام :- ئەبینین ناوی کارتی تۆڕەکە لە دوایی (TCP/IP)، کەئەمە زۆر گرنگە بۆ گۆڕینی کارەکانی .

دەبڵ کلیکێکی لەسەر بکە وە بڕۆ بۆ IP ADRESS ناونیشانی IP وە هەڵبژاردەی دووەم دیاری بکە، وە ئەم ژمارانە لەهەردوو بۆشایی سەرەوەو خوارەوە بنوسە: (١٩٢،١٦٨،٠،١)

(٢٥٥،٢٥٥،٢٥٥،٠)
لەنوسینی ئەم ژمارانە هەڵە مەکە، وەدوایی OK بکە، پاشان کلیکی دوگمەی بەشداربوون لەفایلات وچاپ بکە، کە ئەیبینی لەهەمان چوارگۆشەی گفتوگۆ پاش داخستنی چوارگۆشەی (TCP/IP)، وە نیشانەی راستە لە هەردوو خانەکە بدە، لەدواییدا برۆ (IDENTIFICATION) لەسەرەوە، کەئەوەیان هەڵبژاردنی دووەمە، ئەبینین سێ خانەمان هەیە، لەخانەی یەکەم ناوی تایبەتی کۆمپیوتەرەکەت بنوسە، وە لەخانەی دووەم ناوی تۆرەکە بنوسە بۆ نمونە (HOME) وە خانەی سێهەم بەبەتاڵی جێ بهێڵە .

پاش ئەمانە کلیکی (OK) بکە وە ئامێرەکە دەست بە (RESET) دەکات بۆ ئەوەی بەتەواوی کردارەکان دابنرێن لە کۆمپیوتەری یەکەم.

ئەوەی کردمان بەسەر کۆمپیوتەری یەکەم دووبارە بکەرەوە بەسەر کۆمپیوتەری دووەم بەڵام ژمارەی یەکەم بگۆرە بە: (١٩٢،١٦٨،٠،٢) .

وە ناوی کۆمپیوتەرەکە بکە بەناوێکی تر، بەڵام بەهەمان ناوی تۆرەکە کە بریتی بوو لە (HOME) . وە هەموو کردارەکانی تر وەکو ئەوی تر جێ بەجێ بکە، پاش ئەمانە ئامێرەکان بخەرە کار، وە واباشە تۆرەکە ئامادە بێت بۆ کار، بۆ دڵنیابوون دوو رێگات لەبەردەمە بۆ بەکارهێنان.

رێگای یەکەم:

برۆ بۆ ئامێری کۆمپیوتەر (MY COMPUTER) وە کلیکی راستی ماوس لەسەر بەشی (C) بکەوە (SHARING) واتە بەشداریکردن –هەڵبژێرە وەهەمان کردار لەسەر کۆمپیوتەری دووەم دووبارە بکەرەوە، وە لە یەکێک لە کۆمپیوتەرەکان برۆ بۆ (NETWORK NEIGHBORHOOD)، ئەگەر کۆمپیوتەری یەکەمت بینی ئەوا بزانە کە کردارەکەت جێ بەجێ بووە، وە بۆ دڵنیابوون کلیکی لەسەر بکە دەبێ هارد دیسکی کۆمپیوتەرەکەی تر ببینی .

رێگای دووەم:

برۆ بۆ بەرنامەکان لە لیستی START دوایی DOS هەڵبژێرە وە ئەمەی خوارەوەی تیا بنوسە .

PING ١٩٢،١٦٨،٠،١

بەڵام ئاگاداربە، ژمارەی کۆتایی (١) بنوسە ئەگەر تۆ کارت لەسەر ئەو کۆمپیوتەرە کرد کە ژمارەی (IP ADDRESS) ەکەی (٢) دانرابوو، بەڵام ئەگەر کارت لەسەر کۆمپیوتەرە کرد کە (IP ADDRESS) ەکەت ژمارە (١) داوەتێ ئەوا ژمارەکە بگۆرە بە .

PING ١٩٢،١٦٨،٠،٢

کاتێک ژمارەکەت نوسی (ENTER) بکە، ئەگەر چەند ژمارەو چوار رستەت بۆ دەرکەوت بۆ نمونە نوسرا (REPLY)... وە چەندین نوسینی تر ئەوا مانای ئەوەیە کە کارەکە تەواوە، بەڵام ئەگەر نوسی (TIME OUT) لە چوار رستە، ئەوا مانای ئەوەیە کە کارەکە هەڵەیەکی تیایە .

ئێستا تۆرەکە ئامادەیە ئەوەی ماوەتەوە پێکەوە بەستنی هەردوو کۆمپیوتەرەکەیە، بۆ ئەمیش چەندین بەرنامە هەیە، بەڵام بەرنامەیەک هەیە کە زۆر باشە وە کار کردن لەگەڵی زۆر ئاسانە وە هیچ شتێکی تری ناوێ، تەنها ئیش پێکردنی، لەم سایتە دایبەزێنە بەخۆرایی بە نێوی (ANALOGX PROXY) قەبارەکەی ١٨٨،١ کیلۆ بایتە .

HTTP://WWW.ANALOGX.COM/FILES/PROXYI.EXE

لەسەر هەردوو کۆمپیوتەرەکە دایبەزێنە، وە ئەگەر ویستت کاری پێ بکەی برۆ بۆ C:\PROGRAM FILES\ANALOGX\PROXY لە ناویەوە دەبینین کە رەنگێکی سەوزی هەیە .

ئێستا پرسیارێک دێتە پێشەوە:- کەی کار بەم بەرنامەیە دەکەین ؟

وەڵام :- کارێکی سروشتییە کاتێ ئێمە پەیوەند دەبین بە تۆری ئینتەرنێت لە رێگای یەک کۆمپیوتەر پەیوەند دەبین، وە کۆمپیوتەری دووەم لەرێی کۆمپیوتەری یەکەم بە تۆری ئینتەرنێت، لەمەوە بەرنامەکە بخە کار لەسەر کۆمپیوتەری یەکەم، وە نایەوێ کاری پێ بکەین لەسەر کۆمپیوتەری دووەم، گرنگ ئەوەیە بەرنامەکە کاری پێ بکەین لەسەر ئەو کۆمپیوتەرەی کە پەیوەندە بە ئینتەرنێت .

ئێستا شتێکی گرنگ ماوە ئەویش، لەکۆمپیوتەری دووەم کە پەیوەندە بە تۆر لە کۆمپیوتەری یەکەم، هەڵسە بە کردنەوەی پەرِ هلدەرەوەی ئیکسبلورر وە راستەوخۆ (STOP) بکە، وە برۆ بۆ (TOOLS)، دوایی (INTERNET OPTION)، وە (CONNECTION) هەڵبژێرە وە برۆ بۆ کۆتایی بۆ (LAN) وە نیشانەی راست لەسەر بەکارهێنانی پرۆکسی بکە،وە ژمارەی پرۆکسی خوارەوە بنوسە: ١٩٢،١٦٨،٠،١

ئاگاداربە لەوە گریمان ئەو کۆمپیوتەرەی پەیوەندە بە ئینتەرنێت (IP ADDRESS)ەکەی بریتییە لە(١٩٢،١٦٨،٠،١) گرنگ ئەوەیە ئەو (IP) ە بنوسین کەوا پەیوەندە بە تۆری ئینتەرنێت، وە ئەو مەنفەزە دیاری بکە : (٦٥٨٨) .

ئێستا ئامادەیەک هەموو کارەکان تەواون، ئێستا دەتوانین پەیوەندی بکەین بە تۆری ئینتەرنێت لە کۆمپیوتەری یەکەم، وە کۆمپیوتەری دووەم بە هێمنی ئیش پێدەکەین، وە ئاگاداربە لەبیرنەکەی لە کۆمپیوتەری دووەم TOOLS هەڵبژێرە دوایی INTERNET OPTION وە لەبەشی (CONNECTION) خانەی (پرسیار نەکردن لە سەر پەیوەندی کردن) هەڵبژێرە، لە پێناو ئەوەی راستەوخۆ بەشدار بێت لە تۆر.

# ١٠ خاڵی گرنگ بۆ ئەوەی کومپیوتەرەکەت تووشی ڤایرۆس نەبێت

ئامادەکردنی: کەمال عەبدوڵلا حەسەن
kamal_kurdi@yahoo.com

١- هەر کاتێک ئیمێلێکت بە دەست گەیشت کە بابەتێکی گومان لێکراوی تێیدا بوو هەوڵی ئەوەی مەدە کە فایلی پەیوەستی بکەیەوە (فایلی زەمیمە).

٢- نامەکانی تێکدەر وئەو ئیمێلانەی کە لە لایەن کەسە نەناسراوەکان دەگاتە دەستت، زۆربەیان بابەتی سەرنج راکێشیان تێیدایە،بە هیچ جۆرێک فایلی پەیوەستی ئەم جۆرە ئیمێلانە مەکەوە .

٣- هیچ فایلێک لە ئینتەرنێت داونلۆد مەکە، تەنها لە حاڵەتێکدا نەبێت کە لە سەرچاوەی سایتەکە دڵنیا بی.

٤- پێویستە دژە ڤایرۆسێک (ANTI VIRUSE ) لە سەر سیستەمی کومپیوتەرەکەت دابنێی . دژە ڤایرۆسەکان هەموو فایلەکانی پەیوەست سکان یان کونترۆل دەکەن و ئەگەر شتێکی گومان لێکراو لە ناو فایلەکاندا هەبوو ئەوا ئاگادارت دەکەن .

٥- بە شێوەیەکی بەردەوام پێویستە لە فایلەکانت وێنەیەک هەڵبگریت (BACKUP) هەندێ جار ڤایرۆسەکان هەمووفایلەکان لە ناو دەبەن .

٦- هەمیشە ئاگاداری دوایین هەواڵی ڤایرۆسەکان بە، زۆربەی سایتەکانی ئەمنی نوێترین ڤایرۆسەکان و کارەکانیان دەکەنە لیست لەسەر توری ئینتەرنێت . باشتر وایە بە لایەنی کەمەوە رۆژانە جارێک چاویان پیدا بخشێنی .

٧- هیچ کات هیچ جۆرە فلۆپییەکی بەکارهاتوو تاقی مەکەوە تەنها لە کاتێکدا نەبێت کە پێش کردنەوەی فلۆپی سکانی (SCAN) بکەی.

٨- ئەگەر لە شوێنی کارکردنتدا تۆری لێک پەستراوتان هەیە، هەر کە ڤایرۆسێک کەوتە ناو سیستەمەکەت یەکسەر بەڕێوەبەری تۆڕەکە ئاگادار بکە .

٩- ئەگەر بۆ وەرگرتنی ئیمێلەکانت سوود لە بەرنامەی (MICROSOFT OUT LOOK) وەردەگری، هەڵبژاردەی (AUTOMATIC PREVIEW) کە لە ناو مینوتی (VIEW) دا هەیە رابگرە (بکوژێنەوە) یان (UNACTIVE) ی بکە، چونکە زۆربەی ڤایرۆسەکان لە گەڵ PREVIEW بوون خۆیان پێشان دەدەن (کاردەکەن) . کەسانێک کە لەم بەرنامەیە سوودوەردەگرن بۆ کردنەوەی ئیمێلەکانیان پێویستە بە بەردەوامی پینە ئەمنییەکانی MICROSOFT دانلۆد بکەن و دابەزێنن .

١٠- هیچ کات وەڵامی ئەو ئیمێلانە مەدەوە کە داوای زانیاری نهێنیت لێ دەکات.

سەرچاوە: الشامل نیت

## پۆلیس لەسەر ئەنتەرنێت

وەرگێرانی لەعەرەبیەوە:
هاوێر ئەردەلان

حکومەتی بەریتانی مەبەستی سزادانی تاوانبارانە کە لەڕێگەیی ئەنتەر نێتەوە تاوان ئەنجام دەدەن. بەلام دەسەلات دارانی بەریتانی ئەم پرۆژەیە بەپێشێل کردنی مافە تایبەتمەندەکانی تاک دەزانن. ماوەیەک پێش ئێستا وەزیری ناوخۆیی بەریتانی سەرپەرشتی لەکردنەوەیی ئامێرێک کرُد کە داوایی یەکەیی نەتەوایەتی دەکات بۆ بەرەنگاری کردنی ئەو تاوانانەیی کەلەڕێگەیی پێشکەوتنی تەکنەلۆژیا ئەنجام دەدرێ، بەلام بەرهەلستانی ئەم هەنگاوە ئاگاداری ئەوە دەکەن کە ئەمە دەبێتە ڕێگر بەرامبەر بە بەکارهێنەرانی ئەنتەرنێت بەشێوەیەکی تایبەتی وەدەلێن کە یاسایی ڕێک خراو بۆ ئەو پرۆژەیە ڕێگا بە دەسەلات دەدات بۆ بەیەک بەستنی دایمی گەورە کۆمپانیاکانی ئەنتەرنێت لە بەریتانیا بۆ دەرخستن و نیشان دانی هەموزانیاریەک کەلە ڕێگەیی ئەنتەرنێت ئالوگور دەکرێ تائێستا گفتوگۆ بەردەوامە دەربارەیی چۆنیەتی دروست کردنی قوتوی ڕەش (علبە سوداء) کە دەتوانێت بەسەر هەموو فۆرمە زانیاریەکانی ئەلیکترۆنی تێپەڕ بێت وەلە هەمان کاتیشدا پۆلیس ئەو زانیاریانە ی لە ئەنتەرنێت دەست دەکەوێت.

سەرچاوە: ئەنتەرنێت BBC

# پێناسەی مەکینەی گەڕان

و/ لە عەرەبییەوە:
زەهرا حەسەن




## مەکینەی گەڕان چییە؟

مەکینەی گەڕان (SEARCH ENGINE) بەرنامەیەکە یارمەتی ئەو کەسانە دەدات کە ئەنتەرنێت بەکاردەهێنن بۆ ئەوەی بەئاسانی بەدوای سەرچاوە جیاوازەکاندا بگەڕێن (سایتەکانی ویب و سایتەکانی FTP و سایتی TALENT).

مەکینەی گەڕان لە سێ بەشی سەرەکی پێک دێت:

١- بەرنامەی جالجالۆکە (SPIDER PROGRAM)

٢- بەرنامەی پێرست دانان (INDEXER PROGRAM)

٣- بەرنامەی مەکینەی گەڕان

تێبینی: جێگەی باسە کە هەندێک لەمەکینەکانی گەڕان بەکاردێت بۆ گەڕان بەدوای یەک سایت.

## شەرح کردنی ئیشەکانی بەرنامەکانی گەڕان:

١- بەرنامەی جالجالۆکە:

بەرنامەی جالجالۆکە بەکاردێت بۆ دۆزینەوەی لاپەڕەی نوێ لەسەر سایتی ویب، ئەو بەرنامەیە پێی دەڵێن بەرنامەی خشۆک(CRAWLER)لەبەرئەوەی بەهێمنی لە سەر تۆڕی ئەنتەرنێتدا دەگەڕێت، ئەو بەرنامەیە شوێنی سایتەکان وەردەگرێت لە ناونیشانی لاپەڕەکە (TITLE)، و وشەکان (KEYWORDS)، و ناوەڕۆکی میتا (META TAGS). بەرنامەی جالجالۆکە تەنها لاپەڕەی یەکەمی سایتەکە ناکاتەوە بەڵکو بەردەوام دەبێت بەپێی بەرنامەی بەدواداچوونی پەیوەندیەکان (LINKS) بۆ ئەوەی لاپەڕەی تر بکاتەوە. مەبەستیش لەکردنەوەی ئەو لاپەڕانە بریتیە لە دانانی دۆکیۆمێنتە دیاریکراوەکان لە سیستەمی پێرست دانان لە مەکینەی گەڕان، بۆ ئەوەی مەکینەی گەڕان دواتر بگەڕێتەوە سەری.

٢- بەرنامەی پێرست دانان (INDEXER PROGRAM)

بەرنامەی پێرست دانان یان فەهرەس کراو (INDEX PROGRAM)، کە هەندێک جار پێی دەڵێن کاتالۆگ (CATALOGUE)، بریتیە لە بەرنامەیەکی گەورەی داتابەیس (DATABASE) بۆ وەصف کردنی لاپەڕەکانی ویب. بۆ ئەمەش پشت دەبەستێ بە بەرنامەی جالجالۆکە (SPIDER PROGRAM) و هەروەها پشت دەبەستێ بە هەندێک ووشە کە زۆر دووبارە دەبنەوە.

٣- بەرنامەی مەکینەی گەڕان:

بەرنامەی مەکینەی گەڕان ئەو کاتە دەست پێدەکات کە دەست دەکەین بە نووسینیووشەیسەرەتایی(KEYWORD) لە چوارگۆشەی گەڕان (SEARCH BOX)، دوای ئەوە بەرنامەی مەکینەی گەڕان لە لاپەڕەکانی ویب بەدوای ئەو ووشەیەدا دەگەڕێ لە داتابەیسی پێرست دانان (INDEX DATABASE)، پاشان ئەنجامی گەڕانەکە لە پەنجەرەی براوس (BROWSER WINDOW) پیشان دەدات.

ژمارەیەکی زۆر لە مەکینەکانی گەڕان لە سەر ویب هەیە لەوانەش:

ALTAVISTA
NETSCAPE
LYCOS
EXCITE

ئەو مەکینانە لەیەکتر جیاوازن و هەریەکەیان ڕێگەی خۆی هەیە لەئیش کردن، بۆ نمونە، سایتی ئەلتافیستا (ALTAVISTA) هەموو زانیاریەکانی لاپەڕەی ویب خەزن دەکات، بەڵام سایتەکانی تر ئەوا تەنها ناونیشانی لاپەڕەی سەرەکی خەزن دەکات.

## چۆنیەتی گەڕان (ئالیەتی گەڕان)

پێشتر ووتمان کە مەکینەکانی گەڕان ووشەی سەرەتایی (KEYWORD) بەکاردێنێ لەکاتی گەڕان لە سایتەکانی ویب، ئەو ووشانەش دەکرێ تەنها یەک ووشە بن یاخود چەند ووشەیەک بن (فرێز) بن، وە هەروەها ئالیەتی گەڕان هەندێک ئۆپەرەیتەر (OPERATOR)

| ئۆپەرەیتەر | چۆنیەتی ئیشکردنی |
|---|---|
| " " | بەکاردێت بۆ گەران بەدوای عیبارەی (computer technology) |
| + یان AND | ئەو سایتانەی کە هەردوو ووشەی computer و technology تێدایە ، بەلام مەرج نیە ئەو دوو ووشەیە پێکەوە بن |
| OR | بەکاردێت بۆ گەران بەدوای عیبارەی (computer OR technology) کە ئەو سایتانە دەگرێتەوە کە تیایدا ووشەی computer بەتەنیایە و ووشەی technology بەتەنیایە |
| * | بەم شێوەیە دەنوسرێ Tech* و ئەو سایتانە پیشان دەدات کە بە ووشەی Tech دەست پێدەکەن وەکو technology ، technician ، technical |

بەکاردەهێنن، لە خوارەوەش چۆنیەتی ئیشی ئۆپەرەیتەرەکان نیشان دەدەین:

ڕێبەری گەڕان (SEARCH DIRECTORIES)

ڕێبەری وێب (WEB DIRECTORY)، یان کەتالۆگ (CATALOGUE OR GUIDE)، ڕێگەیەکی ترە بۆ گەڕان بەدوای زانیاریەکان لە سەر تۆڕی ئەنتەرنێت. ڕێبەری ویب، پەیوەندی ڕێک وپێک و ڕێکخراوی تێدایە (کە بەپێی بابەتە گشتیەکان ڕێک دەخرێ) کە یارمەتیمان دەدات بۆ گەیشتن بە سەرچاوەکانی زانیاری. ڕێبەری ویب لەلایەن چەندین کۆمپانیا و دامەزراو ڕێک دەخرێ کە لەبواری ئەنتەرنێت ئیش دەکەن.

### مەکینەکانی گەڕان بە زمانی عەرەبی

لەم دواییەدا چەند مەکینەیەکی گەڕان بە زمانی عەرەبی پەیدا بوون، بەلام سوود وەرگرتن لەو مەکینانە زۆر کەمە لەبەر ئەوەی زمانی عەرەبی تەکنۆلۆژیای ئالۆزی پێویستە، زمانی عەرەبی زمانێکی صەرفیە (MORPHOLOGICAL) بەلام زمانی ئینگلیزی زمانێکی لەصقیە (AFFIXATIONAL).

### دوو جۆر مەکینەی گەڕان هەیە:

کۆمەلەی یەکەم:

ئەو کۆمەلەیە لاسایی مەکینەکانی گەران بەزمانی ئینگلیزی دەکاتەوە و ئەنجامەکەشی زۆر لاوازە لەبەر ئەوەی پشت دەبەستێ بە بەراورد کردن STRING MATCHING بۆ ووشەکانی گەڕان.

کۆمەڵەی دووەم:

ئەو کۆمەلەیە پشت دەبەستێ بە تەکنۆلۆژیای پێشکەوتوو بۆ چارەسەرکردنی زمانی عەرەبی، نمونەی ئەو جۆرەش بریتیە لە ئاراب فیستا ARAB VISTA، ئیدریسی کەلایەن کۆمپانیای صخر بلاوکرایەوە.

مەکینەی ئیدریسی تەکنۆلۆژیایەکی پێشکەوتوی هەیە و زۆر شتی تێدایە، لەوانە:

١-گەڕان لەهاوشێوەکان(SYNONYMS): بەدوای ئەو ووشانەدا دەگەڕێ کە هەمان مانایان هەیە بۆ نمونە گەران بەدوای هاوشێوەکانی ووشەی (مساعدة) هەموو ئەو لاپەرانەمان دەداتێ کە ئەو ووشانەی تێدایە (معونة، مؤازرة ..هتد)

٢- گەران بە مەعنا و وەرگێران: ئەمە بەکاردێت بۆ گەڕان بەدوای ووشەیەکی ئینگلیزی لەڕێگای ووشەیەکی عەرەبی، بۆ نمونە ووشەی (مساعدة) لەزمانی ئینگلیزی هەموو ئەو لاپەرانەمان دەداتێ کە ئەو ووشانەی تێدایە (AID، ASSISTANCE، HELP)

٣- توانای هەڵسوکەوت کردن بەشێوەیەکی باش:

شایانی باسە کە زۆربەی مەکینەکانی گەران بەزمانی عەرەبی هەلدەستێت بە تەرجەمەکردنی ئەو ووشەیەی کە بەدوایدا دەگەڕێین بۆ زمانی ئینگلیزی .

بەتایبەتی ناونیشانی لاپەرە(TITLE)، یەکەم بیست وپێنج ووشە لەو دۆکۆمینتەی کە بەدوای دەگەڕێین، ئەوە جگە لە ناوەڕۆکی میتا (META TAGS).

لە زمانی عەرەبی یەک ووشە دەکرێت بە دەیان شێوەی هەبێت، لەبەر ئەوەی ووشە لەزمانی عەرەبی حەرفی زیادەی پێوەدەنوسێت وەکو (حرف جر، حرف عطف، ضمائر متصلة).

بۆ نمونە (و بمدرستهم، و مدرستهم، لمدرستهم، مدرستنا، مدارسکم) هەموو ئەو ووشانە دەگەڕێنەوە بۆ سەر ووشەی (مدرسة) کە ڕەگەکەی بریتیە لە (درس).

موقع: الساحة العربية








# چۆن بتوانین سوود له ئەنتەرنێت وەربگرین؟

شاخوان عمر حسن

له ناوەراستی هەشتاکان به دواوه له وولاته یەکگرتوەکانی ئەمەریکا کێ برکێ له سەر فێربوونی کۆمپیوتەر دەکرا، تا وای لێهات ئەوەی که زانیاریەکی ئەوتۆی له سەر کۆمپیوتەر نەبوایە، به نەزان و کەمتەرخەمیان دەزانی، حوکومەت له لایەک و کۆمپانیاکانی درووست کردنی کۆمپیوتەر له لایەکی تر هەولی دابینکردنی کۆمپیوتەریان دەدا له هەموو مالێکدا، کاتێکیش تۆری ئەنتەرنێت پەرەی سەند به هەمان شێوه تەوژمێکی گەوره خەلکی گرتەوه له سوود وەرگرتن و بەستانی کۆمپیوتەرەکانیان به ئەنتەرنێتەوەو وەرگرتنی زانیاریەکان له رێی ئەنتەرنێت ئەمجارەیان ئەوەی کۆمپیوتەرەکەی به ئەنتەرنێتەوه نەبەستایه، بەبێ ئاگا و دوور له گۆمەلگای مەدەنی و شارستانیان دەزانی، ئیتر ئەو هەموو گرنگی دانه به ئەنتەرنێت وایکرد ببێت به گەورەترین مەلبەندی زانیاری له جیهاندا، ئێستا له هەزارەی سێهەم داین ئەنتەرنێت خەریکه شوێنی زۆربەی ئۆرگانەکانی تر دەگرێتەوە، بۆ نمونه ئەنتەرنێت وەکو دەزگایەکی رۆژنامەوانی ئازاد، گفتوگۆی ئازاد، ناوەندێکی بێ سنوور بێ سانسۆر وادونیای تەنیوه و مەترسی له سەر ئۆرگانەکانی تر درووست کردوه . ئەم تایبەتمەندیەی ئەنتەرنێت وەکو مامۆستا وەکوه دکتۆر وەکو زانکۆ، دایەنگە، گەورەترین خانەی کتێب وەکو هەرچیەکی پێویستی ژیانی مرۆڤه بەرجەستەی دەکات تا ئەو سنورەی ئەنتەرنێت له دایەنگەکان وه تاکو بەرزترین کایەی دەولەت وجودی هەبێت، له رۆژگارێکی وەکو ئەمرۆدا ئەنتەرنێت هەوارگەیەکه که له کەلتور و شارستانیەت و له فەلەسەفەوله فکرو بۆچون و له زانیاریەکانی سەردەم و بابەته دێرینەکان و هتد .. تا ئێستا نەتوانراوه هیچ پێوەرێک بۆ قەبارەو گەورەیی و فراوانیەکەی دابنرێت، ئافرەتێکی ئەفریقی هەولیدابوو له رێگای مالپەرەکانی ئەنتەرنێت ئامۆژگاری له سەر نەخۆشی ئایدز وەربگرێت له ئەنجامی گەرانیدا له ناو مالپەرەکان زیاتر له ١٦ ملیۆن مالپەری دۆزیبوەوه له سەر ئەم نەخۆشیه، ئاخۆ دەبێت ئێمه کاتێک مەبەستمانه زانیاری وەرگرین چۆن بیدۆزینەوه وه چۆن سودی لێوەربگرین، کاتێک ئەنتەرنێت مامۆستایەکی زیرەک و زرنگ و به توانا له زانیاریدا، ئەوەنده ئازاو چوست و چالاکه دەتوانێ به زمانی هەموو نەتەوەکانی جیهان قسه بکات و زانیاری ببەخشێت بەبێ سانسۆر له ئەلفی سروشت و تا لامی داهێنانەکانی جیهان له خۆ دەگرێت، رێک له زانیاری و پێک له بابەت دا وورد له رێخستن و چەلەنگ له زانیاریدا . چۆن بگەینه ئەوەی که دەمانەوێت، زۆرگرنگه ئینسان ئەوەی که دەیەوێت به دەستی بێنێت تا ئەگەر له گەلێشی ماندوو بێت، بۆیه لێرەدا من دەمەوێ ئاماژه بۆ چەند خالێک بکەم بۆ ئەوەی بتوانین سوود لەم مەلبەندەی زانیاریەکان وەربگرین، چ له شوێنه گشتیەکان یان له و کۆر و کۆبونەوانەی لەسەر ئەنتەرنێت بووبن هەمیشه ووتومه بۆ ئەوەی زانیاری مەستدار بەدەست بێنین ئەبێت بەبەرنامەیەکی رێک و رەوان روبەرۆی شاشەکانی کۆمپیوتەر ببینەوه بۆ نمونه بەرنامەی من بۆ بەیانی له ئەنتەرنێت گەرانه بەدوای زانیاریەکان دەربارەی نهێنیەکانی کۆمپیوتەر، دوایش دوو نامه بۆ هاورێکانم دەنێرم نامەی هاتوش دەخوێنمەوه، خۆ ئەگەر ئەم رێکخەریه له بەرنامەکانت دا نەبێت له کاتی سەردانی کردنت بۆ ئەنتەرنێت زۆرترین جار تووشی بێزاری دەبیت و له ناو ئەم هەموو زانیاریەدا چەندان شتی بەکەلکت له دەست دەچێت، جگه لەمەش کاتێکی زۆر به فیرۆ دەروات . ئەنتەرنێت ماموستایەکه بەگوێرەی داواکانی ئێمه کاردەکات بۆیه دەبێت زیرەکانه داواکانی پێ بدەی تاکو بتوانێ بمانگەیێنێته شوێنی مەبەستدار چونکه، هەگبەیەکی گەورەیه له لایەکی ترەوه پێویسته هەموو ئەو مالپەرانەی که سوودیان لێ وەردەگرین و چەن جاریتریش سەردانی دەکەین پێویسته لای خۆمان له فلاش دیسکدا ئەرشیفیان بکەین بۆ ئەوەی له کاته پێویستەکاندا یان بۆ سوود گەیاندن به هاورێیەکت بەکاری دەهێنیتەوه.

له ژماره سێی گۆڤاری کۆمپیوتەر بابەتێک لەسەر سەیڤ کردن و ئەرشیف کردنی مالپەرکان بلاوکراوەتەوه دەتوانی سوودی لێوەربگری . به بەردەوامی له کاتی کارکردنت زیاتر له مالپەرێک بکرەوه بۆ ئەوەی تاکو فەرمانی یەکێکیان جێبەجێ دەبێت کار له سەر ئەویتریان بکەیت بەمەش کەمترین کات به فیرۆدەچێت، هیچ کاتێک له سەردانەکانتدا بۆ ئەنتەرنێت کاتی کارکردن دیاری مەکه چونکه به دیاری کردنی کاتەکه توشی پەشۆکی و شێواوی دێیت ناتوانی به ئارامی بەدوای زانیاریەکاندا بگەرێیت . بۆیه هەمیشه هەولبده ئاسوده و ئارام بەدوای زانیارییەکاندا بگەرێیت.

# کوکیز چییە (cookies)؟



**ئا: ژیلوان کەرکوکی**

زۆر لە سایتەکانی ئینتەرنیت کەدەبیتە میوانیان، مەلەفێکی بچووک لەسەر هارد دیسکی ئامێرەکەت دادەنێت، ئەم مەلەفە پێی ئەوترێ ((کوکی)) (COOKIE)، مەلەفی کوکیز بریتییە لە مەلەفێکی نوسراو، نە شێوەی بەرنامەیە وەنە شێوەی کۆدی بەرنامەیین وە ئامانج لەم کوکییە کۆکردنەوەی زانیارییە دەربارەی تۆ، کەلەوانەیە جار بەجار بە سودیش بێت، بەتایبەتی لەو کاتانەی کە سایتەکە داوای ووشەی نهێنیت لێدەکات، بۆ ئەوەی ئازاد بیت لە چوونە ژوورەوە، لەبەرئەوە لەم حاڵەتە نایەوێ هەموو جارێک ووشەی نهێنی بنوسیت بۆ چوونە ژوورەوە، چونکە سایتەکە خۆی ئەگەڕێت بەدوای وشەکە لە ڕێگای ((کوکی))، کەدایناوە لەسەر هارد دیسک، لەچوونە ژوورەوەی یەکەم. بە مانایەکی تر ناوەڕۆکی ئەم مەلەفە نوسراوانە ((کوکیز)) بریتییە لە چەند زانیارییەک کە یارمەتی سایتەکە دەدات بەگەڕانەوەی ئەو زانیارییانەی کەدایناوە لەکاتی پێویست، واتە لە چوونە ژوورەوەی یەکەم کە کردبووت. بەڵام ئەتوانرێ ئەم ((کوکیز))ە بەکاربهێنرێت بۆ پێشێل کردنی تایبەتمەندییەکانی بەکارهێنەرەکان وە کۆکردنەوەی زانیاری دەربارەیان لە کاتی بەکارهێنانی سایتەکان. ئەگەر ئێوە حەز نەکەن کە مەلەفی ((کوکیز)) دابنرێ لەسەر ئامێرەکانتان، بە ئامانجی کۆکردنەوەی زانیاری دەربارەی ئێوە، ئەتوانرێ پەرِ هەڵدەرەوەی سایت ئامادە بکرێت، بۆ ئەوەی داوای ڕەزامەندی تۆ بکات، پیش ئەوەی هیچ کوکیەک خەزن بکات لەسەر هارد دیسک.

**چۆن مەلەفی کوکیز دائەنرێت لەسەر ئامێرەکەت ؟**

لەکاتی نووسینی ناونیشانی سایتێک لەلیستی ناونیشان، کەداوای ئەم سایتەت کردووە کەدیارکراوە، لەمەوە پەڕهەڵدەرەوەی سایت بە زانینی ناونیشانی IP تایبەت بەو، وەجۆری بەرنامەی بەکارهێنانی سایت، وە ئەو ڕژێمەی کە ئامێرەکەت بەڕێوە دەبات. ئەم هەموو زانیارییانە خەزن دەبن لەناو فایلێکی نوسراو لە کۆکەرەوەی (مزود) LOG FILES، وە کوکی هیچ پەیوەندی بەم زانیارییانە نییە کە ئەینێرێت، وە لەهەمان کاتدا، بەرنامەی پەڕهەڵدەرەوە دەگەڕێت بەدوای مەلەفی کوکیز کەتایبەتە بەو سایتەی کە داوات کردووە، ئەگەر بینیەوە ئەوا دەینێرێ لەگەڵ داوای پیشاندانی سایتەکە، بەڵام ئەگەر مەلەفی کوکیز دیار نەبوو، ئەوا سایتەکە دەزانێ کەئەمە میوانی یەکەم جارە، لەمەوە هەڵدەستێ بەناردنی مەلەفی کوکیز وە خەزنی دەکات لەسەر ئامێرەکەت. وەسایتەکە لەتوانایدا هەیە کەئەم زانیارییانەی لەناو مەلەفی کوکیز هەیە بیگۆڕێت یاخود زانیاری نوێی بخاتە سەر هەموو جارێک کە دەچیتە ناو سایتەکە.

**چۆن ئەتوانین قەدەغەی ناردنی کوکیز بکەین ؟**

لەتوانامانددا هەیە کەوا بەرنامەی پەڕهەڵدەرەوەی سایت ئامادەبکەین، بۆ ئەوەی لە کاتی ناردنی کوکیز داوای ڕازی بوونی تۆ بکات، پێش ئەوەی هیچ کوکیزێک خەزن بکات لەسەر هارددیسک (ئەتوانی ئەمە ئەنجام بدەیت لەبەرنامەی INTERNET EXPLORER ٣,٠٢ لەڕێی فەرمانی VIEW، پاشان OPTION،دوایی ADVANCED، وەدانانی نیشانەی ڕاست لەچوارگۆشەی WARN BEFOR ACCEPTING COOKIES". وەلە بەرنامەی NETSCAPE NAVIGATOR ٣,٠، لەڕێی فەرمانی OPTION، پاشان NETWORK PREFERENCES، پاشان PROTOCOLS. وە لابردنی نیشانەی دیاریکردن لەناو چوارگۆشەی ACCEPTING A COOKIE. وە لە INTERNET EXPLORER ٥,٠ بڕۆ بۆ TOOLS پاشان INTERNET OPTION وەدیاری کردنی SECURITY وەدوایی کلیک بکە لەسەر CUSTOM LEVEL وە ئەبینین لەخوارەوەی لاپەڕەکە تایبەتمەندی یەکانی کوکیز، کە دەتوانێ بیگۆڕن بەپێی ئارەزووتان.

# ڕۆژنامەی ئەلیکترۆنی و تایبەتمەندیەکانی

وەرگێرانی لەعەرەبییەوە:
ڕێناز حەوێزی

ئەگەر دۆزینەوەی چاپ کردن لەلایەن (گۆتن برگ) دادەنرێت بەسەرەتایی دەرکەوتنی ڕۆژنامە بەمانا ناسراوەکەی بەڵام دۆزینەوەی ئەنتەرنێت بڵاوبونەوەی بەشێوەیەکی فراوان و خێرا لەزۆربەی وڵاتانی دنیا گۆڕانکاری بنەڕەتی لە لەڕۆژنامەو پیشەی ڕۆژنامەنووسی دروست کرد، بەهۆیی سەر هەڵدانی جۆرێکی نوێ لە ڕۆژنامە کەناو دەبرێ بەڕۆژنامەی ئەلیکترۆنی (E LECTRONIC NEWS PAPER) یان ڕۆژنامەی بێ کاغەز (PAPERLESS NEWS PAPER) کە وەک ڕکابەر بۆڕۆژنامەی چاپ کراو دەیەوێ خۆیی بسەپێنێ. لەگەڵ ئەوەی کەمانایی ڕۆژنامەی ئەلیکترۆنی و دیاری کردنی سنورەکانی و شێوازی کارکردنەکەی بەتەواوی ڕون نەبۆتەوە، هەندێ لایەنی شاراوەیە ڕۆژنامەکە نوێ یە سەر بەکۆمەڵگایی زانیاریە (I NFORMATION SOCIETY). بەڵام دەتوانین بڵێن کەبیرۆکەی بنەڕەتی لەڕۆژنامەی ئەلیکترۆنی خۆیی دەبینێتەوە لەوەرگرتنی بابەتە ڕۆژنامەوانیەکان لەسەر شاشەی کۆمپیوتەر بۆ نوسین و دەرهێنانی و ئامادەکردنی تابەکارهێنەری تۆڕەکانی ئەنتەرنێت لەسەر شاشەی ئامێرە تایبەتیەکانیان وەری بگرن .بویە دەتوانین بڵێن کەڕۆژنامەی ئەلیکترۆنی ئەو ڕۆژنامەیەیە کەبابەتەکانی کۆدەکرێتەوە



دابەش دەکرێ بەشێوەیەکی ڕێکخراو لەسەر تۆڕەکانی ئەنتەرنێت،بۆیە ڕۆژنامەی ئەلیکترۆنی بریتیە لە ئامرازێکی ڕاگەیاندن کەلەڕێگای تۆڕەکانی ئەنتەرنێت دەگاتە جەماوەر،جیاوازە لە گەڵ هەندێک زاراوەی نزیک لەوانە وەک هەواڵی ئەلیکترۆنی (NEWS ELECTRONIC) کەپێشتر بەکاردەهێنرا بۆئاماژە کردن بۆجۆرێک لەکاری ڕۆژنامەگەری کە ئامرازی ئەلیکترۆنی وەک ڕادیۆ و تەلەفزیۆن بەکاری دەهێنن لە چوارچێوەی ڕژێمێکی دیاری کراو وەک (تلیتێکست). زاراوەی ڕۆژنامەی ئەلیکترۆنی بەشێوەیەکی گشتی ئاماژەدانە به دوو جۆر لە ڕۆژنامە:

یەکەمیان: ڕۆژنامەی چاپ کراو خۆیی کە پیشان دەدرێت لەسەر تۆڕی ئەنتەر نێت بەشێوە تەقلیدیەکەی خۆیی و بەتەواوی ناوەرۆکەکانیەوە بەکارهێنەری تۆڕی ئەنتەرنێت لەڕێگەی شاشەی کۆمپیوتەرەوە دەتوانێ بیخوێنێتەوە بەهەمان ڕێگەی خوێندنەوەی ڕۆژنامەی تەقلیدی .

دوەمیان: ڕۆژنامەی ئەلیکترۆنی بە مانا وردەکەی کە بابەتەکانی دەنوسرێ و نەخشەی بۆ دەکێشرێ و ئامادە دەکرێ تا وەک ڕۆژنامەیەکی ئەلیکترۆنی لە سەر تۆڕەکانی ئەنتەرنێت ڕێک بخرێت بەشێوەیەکی زیندو ڕاستەوخۆ بابەتەکانی پیشان دەدرێ بەکار هێنەری ئەنتەر نێت دەیخوێنێتەوە پاشان دەتوانێت لە بەری بگرێتەوە (استنساخ) ئەگەر ئارەزووی کرد .

بۆزانینیش تەنها لە ویلایەتە یەکگرتوەکانی ئەمریکا زیاتر لە (٢٧٠٠) گۆڤارو ڕۆژنامە لە هەردوو جۆرەکە لەسەر تۆری ئەنتەرنێت هەیە .

بەڵام لە هەرێمی کوردستانی عێراق زۆربەی ئەوڕۆژنامانەی کە دەردەچن بەشێوەی چاپ کراو خراونەتە سەر تۆڕەکانی ئەنتەرنێت بەشێوەیەک کەهەموو

بەکارهێنەرێکی ئەنتەرنێت کەزمانی کوردی بزانێت دەتوانێت بیان خوێنێتەوە لەسەر شاشەی کۆمپیوتەرەکەی لە هەر شوێنێک لە جیهاندا بێ . کەئێستاش خەریکە لەکوردستانی خۆمان ئەم جۆرە ڕۆژنامە ئەلیکترۆنینە سەر هەڵدەدەن بۆ نمونە وەک (پەیامنێر،کوردستان نێت،کوردستان پۆست ...... هتد) .

**تایبەتمەندیەکانی ڕۆژنامەی ئەلیکترۆنی:**

چەند جیا کاریەک هەیە لەنێوان ڕۆژنامەی ئەلکترۆنی و ڕۆژنامەی چاپ کراو هەیە هەندێ لەم جیا کاریانە ڕۆڵی خۆیی دەبینێ لە بەر پرسیەتی دادوەری ڕۆژنامەگەری شارستانی .... ئەم چەند برگەیەش جیا کاریەکان یەک لا دەکاتەوە:

**١-پابەند نەبوون بە پێوانەیەکی دیاری کراو:**

کرداری گواستنەوە لە لاپەڕەیەکی کراوە بۆ لاپەڕەیەکی تر لە تۆڕی ئەنتەرنێت (W W W) زۆر ئاسان و خێرایە بۆیە پابەند نابێ بە پێوانەیەکی دیاری کراو چونکە ئەنتەر نێت زۆر بەر فراوانە .

**٢- پێک هاتەیەکی گشتیە لە کەناڵەکانی ڕاگەیاندن و ڕۆژنامە گەری:**

دەتوانی ئەوەی کە لەڕۆژنامەو T V، گۆڤارەکان و ووتار و وێنە بە دەستت دەکەوێ لە هەمان کات دەتوانرێ گشتیان لە سایدێکی ڕۆژنامەی ئەلکترۆنی بە دەستت بگات .

**٣-دروست بوونی ڕەنگ دانەوەو کار دانەوە لەنێوان بەکارهێنەرو ڕۆژنامەکە:**

زۆر بە ئاسانی پەیوەندی لە نێوان ڕۆژنامە و نوسەرو خوێنەر سەر هەڵدەدات ئەویش لەڕێگایی (ئیمێل) کە وایی کردووە بەرهەمەکانی خوێنەر زۆر بە ئاسانی بەدەستیان بگات و بڵاو بکرێتەوە چ وەک بەرهەم یاخود وەک ڕەخنەو بۆچوون .

**٤-جیهانی ڕۆژنامەی ئەلیکترۆنی:**

جیهانی ڕۆژنامەی ئەلیکترۆنی بۆ ئەنتەرنێت دەگەڕێتەوە چونکە هەر کەسێک لە جیهان ئەگەر کۆمپیوتەری هە بێ دەتوانێ بچێتە ناو تۆری زانیاری جیهانی، هەروەها ڕۆژنامەیی ئەلیکترۆنی کەبەشێکە لە لە جیهانی ئەنتەرنێت بە پێچەوانەی ڕۆژنامەی چاپ کراوە کەڕۆژنامەیی چاپ کراو لەچوارچێوەی سنورێکی جوگرافی دیاری کراوە لە هەمان کاتدا بڕێکی زۆری خەرجی تێدەچێ بەڵام ڕۆژنامەیی ئەلیکترۆنی دەتوانی سنوری وڵاتانێکی زۆر ببڕێ بێ خەرجیەکی زۆر،هەروەها چەند جۆر لە شارستانیەتی جیاواز لە یەک نزیک دەکاتەوە و ڕۆشنایی هزری فراوانتر دەکات . بەڵام لە هەمان کاتدا دەبێتە دروست بونی هۆیی نێگەتیفی لە بوارو جیاوازی داب و نەریت و جۆری دەسەڵات و حوکم ڕانیەتی لە نێوان وولاتاندا .وەک ئەوەی لە هەندێ ووڵات بە بیرو ڕایی ڕاستەوە خۆ دەچێ لە هەندێ وڵاتان بە پێشێل کردنی مافی ئەو ووڵاتە دەبێ . ئەمەش دەبێتە هۆیی سەر لە نوێ دارشتنەوەیی یاسایی ڕۆژنامەگەری جیهانی.

**٥-خێرایی**

بۆ گەیاندنی هەواڵ پێویست بەخێرایی هەیە تابێتە پێشرەوی ڕۆژنامەکانی تر هەروەک ئاشکرایە کەڕۆژنامەی ئەلیکترۆنی زۆر حێرایە لە گەیاندنی هەواڵەکان لە میانەی یەک خولەکدا، بەتایبەتی ئەگەر ئەم ڕۆژنامەیە ئەلیکترۆنی بێ چاپ کراو نەبێ .بۆیە دەبێ زۆر ئاگاداری هەواڵەکان بێ چونکە بوونی هەڵە لە هەواڵ زۆرە لەڕۆژنامەی ئەلیکترۆنی چونکە ڕاستەوخۆ دەنێردرێ بڵاودەکرنتەوە بە پێچەوانەی ڕۆژنامەیی چاپ کراوە چونکە ئەمەیان بەزۆر قۆناغ تێ دەپەڕێ تاخو بڵاو دەبێتەوە.

**سەرچاوە: مسؤولية الصحفي المدنية**

**سامان فەوزی عومەر**

# پۆستی ئەلیکترۆنی دەبێتە هۆیی بێزاری ودڵ تەنگی

**وەرگێرانی لەعەرەبیەوە:**

**سلیم قادر**

بەدوا چونی پۆستەیی ئەلیکترۆنی و وەلام دانەوەیی ئەم هەموو نامە زۆرانە کارێکی یەکجار ماندووبونی دەوێ وەدەبێتە هۆیی بێزاری. بۆیە لە نوسراوێکی هاوبەش هاتووە لەنێوان پەیمانگایی کارگێری بەریتانی و دەزگای بی بی سی بۆچارەسەری تەندروستیە هەروەها لەنوسراوەکە دەڵێ پێویستی بەدواچونی پۆستی ئەلیکترۆنی وە وەلام دانەوەیی ئەم نامانە لەخشتەکە لەخاڵی دەیەم هاتوە زیاتر ئەم کارانە دەبێتە بێزاری و دڵ تەنگی لەکارکردن ئەوکەسانە لەڕیزی پێشکەوتوەکانن کارەکانیان ناگونجێن لەگەل یەکتری و زۆری میوانەکان بۆتە دروست بوونی کەش و هەوایەکی خراپ لەکارکردن .ئەم هۆیانەیی دەبێتە دواکەوتنی گەیشتنی نامەکانی ئەلیکترۆنی دەبێتە بێزاری و دڵ تەنگی لەکارکردن .

بۆیە دەبێ تەواو بوونی کار لەکاتی خۆیی ئەنجام بدرێ (مارک هیستنج) بەڕێوەبەری پەیمانگایی کارگێری بەریتانی هۆبەیی سیاسی وەزۆری بەڕێوەبەرەکان نازانن چۆن پۆستەیی ئەلیکترۆنی بەکار بهێنن بەشێوەیەکی ڕێک وپێک .دیسان (هیستنج) ئەڵێ زۆر کەس وایی پێ چاکە وەلامی ئەم پرسیارانە بەشێوەیەکی یەکجار بە پەلە بدرێتەوە چونکە نامەکە ڕاستەوخۆ و بە پەلە بدۆزرێتەوە وەبێزاری و دڵ تەنگی بۆتە هۆیەکی سەرەکی پۆستەی ئەلیکترۆنی پێش ئەوەیی بێتە هۆیەکی سامناک و ترسناک.

سەرچاوە : BBC.COM

# فلاش میمۆری چییە؟

و: لەعەرەبییەوە فارس سەعدی




فلاش میمۆری ئێستا زۆر بەچالاکانەو بەربڵاوی بەکار دەهێنرێ بۆ داکردنی زانیاریەکانی کۆمپیوتەر کەبەئاسانی هەڵدەگرێ و دەگوازێتەوە. هەموو ئەو خەسڵەتانەی لەهۆیەکانی تری داکردندا هەیە بەفراوانیەکەشیەوە، بەرگریکردنی لەکەوتنی و هۆکارەکانی ژینگەییش، لەگەڵ تەمەن درێژیشی. لەم وتارەماندا تیشک دەخەینە سەر جۆرەکانی فلاش میمۆری و بەکارهێنانەکانیان وباشترین جۆریان کامانەیانن لەبازاڕدا .

## فلاش میمۆری چییە؟

ئامێرێکی بچووکەو بەئاسانی زانیاریەکی زۆری کۆمپیوتەری تیادا دەکرێ، هیچ بەشێکی جوڵاوو گۆڕەری نیە و هیچ بەشی موگناتیسی و رووناکی نییە. بەڵکو تەنها ستریپێکی ئیلیکترۆنی تیایە زانیاریەکانی لەسەر تۆمار دەکرێ یا دادەکرێ. بەم یەکەیە دەگوترێ فلاش میمۆری (FLASH MEMORY) وەک لە وێنەی (١) دیارە. بۆ یەکەمین جار لەسەرەتای ساڵانی هەشتاکانی سەدەی ڕابووردوو لەلایەن کۆمپانیای تۆشیباوە بەرهەم هێنرا، لەخەسڵەتەکانی ئەوەیە زانیاریەکانی سەری دەمێننەوە کاتێک ووزەشی لەسەر ببڕێ، بەپێچەوانەوەی میمۆریەکانی تر وەک میمۆری RAM کە لەگەڵ گشت ئامێرە کۆمپیوتەریەکان بەکار دەهێنرێ. زانیاریەکانی سەری هیچ ناهێنن بە تەنها کوژانەوەی یا داخستنی ئامێری کۆمپیوتەرەکە.

هۆی گەیاندنی فلاش میمۆری بە ئامێری کۆمپیوتەرەوە پێی دەگوترێت (USB) کە ئێستا لە هەموو ئامێرکدا هەیە.

فلاش میمۆری لە (٨) مێگابایت تا (٢) گێگابایت. کەفراوانیەکانیان دەگاتە سێ بەقەدەر فراوانی (CD) .دەتوانرێ دەنگی بۆ ماوەی (٣٣) کاتژمێر لەسەر دا بکرێ بەشێوازی (MP3).

قەبارەیان بەگشتی بچووکە و سوکن، درێژی فلاش میمۆری (٥) سم ڕەت ناکات و کێشەکەشی لە (٣٠) گم ڕەت ناکات٠ کێشیان هێندە سووکە،لەتوانایی (١٤) مێرولەدا هەیە هەڵیبگرن بیگوازنەوە.

## فلاش میمۆری
## تەحەدایی جوگرافیا دەکات

لەبەر ئەوەی فلاش میمۆری هێندە بڵاو بۆتەوە خەڵکی بەزۆری بەکاری دەهێنن،سنوری جوگرافیایی ڕەت داوە،لەتوێژینەوە یکی دەزگایی (جارتتر-داتا کویست) تێکڕایی ئەو میمۆری و فلاشانەی لەساڵی٢٠٠٤ فرۆشتویانە گەیشتۆتە ٦،٤٥ ملیۆن دانە، وا چاوەڕوان دەکرێ لەکۆتایی ئەم ساڵدا ئەم ژمارەیە بگاتە ٢،٦٧ ملیۆن فلاش میمۆری بفرۆشرێ و لەساڵی ٢٠٠٨ دا چاوەڕێ دەکرێ بگاتە ٩٨،٢ ملیۆن دانە. گومان لەوەدا نیە هۆی بەربڵاوی ئەم ئامێرە بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە، چوونکە دەیان جۆر بەکارهێنانی هەیە، لەوانە گواستنەوەی زانیاری گرنگ، لەو کاتەی وەک مەکتەبێکی گواستراوەوایە، هەردەم دەتوانی سەنەدات و بەڵگەنامە و پرۆتۆکۆڵەکانت و زنانیازیە پێویستەکانت بەئاسانی لەگەڵ خۆت هەڵیان بگری لەگەشتێکی دورودرێژدا یا لەوڵاتەکەت بۆ وڵاتانی تر، هەروەها دەتوانی دانەیەک یا وێنەیەک لەو زانیاریانەی کە تەتبیقی دەکەی بەکاری بهێنیتەوە بەئاسانی و سێڤی بکەی لەمیانی یاریدەدەری فلاش میمۆریەکان لەوێن دا (MOZILLA FIREFOX) یا لە هۆکارێکی تری میمۆریەکەت. لەخسڵەتە باشەکانی فلاش میمۆری ئەوەیە، لەگەڵ گشت سیستمەکانی بەکارهێنانی کۆمپیوتەر وەک مایکرۆسوفت ویندۆز بەڤێرژنەکانی ٩٨ و ٢٠٠٠ و ME و XP و سیستەمی ماکنتۆش لەسەرەتادا بەفێرژنی X9 یاسیستەمی لینکس بەڤێرژنی KEMEL 2.4، ئەو فلاشانە پێویستیان بەپرۆگرامی ترنیە بەئیشیان بخەی وەک پرۆگرامیDEVICE DRIVERS یا هەر پرۆگرامێکی تر تایبەتی، تەنها لەگەڵ فیشەی USB ببەستەوە و یەکسەر دەتوانی کاری پێبکەی .

## تەحەدای مێژوو دەکات

لە خەسڵەتە گرینگەکانی فلاش میمۆری، ئەوەیە تەمەنی درێژە، بەرەنگاری کەوتن و پێکدادان و هۆکارەکانی کەش و هەوا دەکات. دەڵێن زانیاریەکانی سەری دەتوانی بۆ ماوەی (١٠) ساڵ بۆت بپارێزێ، سەرەڕای ئەوەی دەتوانی زانیاریەکانی سەری بکوژێنیتەوەو یا نووسینی تازەی لەسەر بکەیتەوە بۆ زیاتر لە (٣٠٠) هەزار جار، کەئەم

خەسڵەتە لە هیچ هۆکارێکی تردا نیە.

ئەگەر بەراوردکاریەک بکەین لەگەڵ فلاش میمۆریەکانی تر و هۆکارەکانی تری دا کە دەگوازرێتەوە و جێگرنین، فلۆپی دێسک بەنموونە دێنینەوە، کەچەندین ساڵ بەبەربڵاوی بەکاریان دەهێنا بۆ گواستنەوەی زانیاری. دەبینین فراوانی ئەم فلۆپیانە (١،٤٤) میگابایتە، کەهێندە کەمە بەراورد ناکرێ لەگەڵ فراوانی فلاش میمۆریدا٠ لەو کاتەی زووش تێک دەچێت و ناتوانرێش بەتەنها بەکار بهێنرێ بەڵکو دەبێ کۆمپیوتەرەکە فلۆپی درایڤی هەبێت. (یا دیسک درایڤە). بۆ مامەڵەکردن لەگەڵ (CD) یدا دەبێ زۆر بەوریایی کاری پێ بکەیت و بەکاری بهێنی، نەوەکا شوخت و پەڵە و ماک لەسەری پەیدابێت و ئینجا ناتوانرێ زانیاریەکانی سەری بخوێنرێنەوە . بەڵام لە فلاش میمۆری ئەم خاڵانە کەم رودەدەن و زۆر بەئاسانی بەکاردەهێنرێ. لەو کاتەی ئەگەر زانیاریەکانت خستە سەر (CD) دەبێ لەناو کۆمپیوتەرەکەت (CD) رایتەر دابنێ تا زانیاریەکان لەسەری تۆمار بکات، بەڵام بوونی USB شتێکی ئەوتۆینە و ئێستا بەزۆری لەناو گشت کۆمپیوتورەکان دادەنێن.

زیاترە لە هۆکاری داگرتنی زانیاری:

پێشان جۆرو شێوەیئەم فلاش میمۆریانە بەچەندین جۆر دەخرانە بازار ڕەوە، بەڵام ئێستا لەوە چۆتە دەرەوە، ئەوەتا ئێستا نەک تەنها ئیشی ئەوەیە زانیاری لەسەر دابگرێ یاسیڤ بکرێ، بەڵکو ئەوەتا یەکێک لەکۆمپانیاکانMSI جۆرێکی (MEGA STICK) ی بەرهەم هێناوە لەناو یەک ئامێردا کۆکراونەتەوە، سەرەرای ئەوەی فلاش میمۆری، بەکارهێنەری (MP3) یە، (رادیۆیی FM




ە، ریکۆردەرە، هۆکارێکە بۆ فێربوونی زمانەکان.

JUMP DRIVE TOUCH GUARD

لەکۆمپانیای (LEXAR) بەرهەمێکی تر، تیشکی زۆر گرنیگ تیایدا دابین دەکات بەمۆری پەنجە زانیاریەکانی خۆیی دەکات، کەسانی تر ناتوانن ئەو زانیاریانە بێننە دەرەوە، تەنها لەرێگایی خاوەنەکانیان نەبێ کەبەمۆری پەنجەیی خۆیی کەلەسەری تۆمار کردوە دەکرێتەوە زانیاریەکانیان ئاشکرا دەکرێت یادەگوازرێنەوە بۆئامێرێکی تر بەرهەمێکی تری زۆر گرنگ کە کۆمپانیایی POWER HOUSE TECHNOLOGIES بەرهەمی(MIGO) ی هێناوە ئاراوە بەم ئامێرە هەما هەنگی لەنێوان زانیاری ئەم فلاش میمۆریەو ئامێری کۆمپیوتەرەکەدا (SYNCHRONIZE) دەکات.

وەک پەیامەکانی پۆستی ئەلیکترۆنی، ئامادەکاریەکانی ویندۆز لیستی سایتە باشەکان (FAVORITES). کۆمپانیایی (MERITLINE) دووبەرهەمی زۆر گرنگی بەرهەم هێناوە، یەکەمیان (PEN DRIVE)ە کەدەتوانێ نوسینی خۆتی پێ بکەیی وەک قەڵەمێکی ئاسایی و لەهەمان کاتدا زانیاریەکانتی لەناو سەیڤ بکەیی.

بەڵام بەرهەمی دووەم ئەوەیە (RIST MEMORY WATCH)ە.

لەوکاتەیی وەک کاتژمێرێکی ئاسایی کاتەکانی خۆتی پێ دەزانی کۆنترۆڵی دەکەی لە هەمان کاتدا زانیاریەکانیشت لەسەری سێڤ دەکەی.

کۆمەڵێک لەباشترین فلاش میمۆری دەخەینە ڕوو:

لەبازاڕدا بەدەیان و سەدان جۆرو شێوە فراوانی فلاش میمۆری هەن. کێبەڕکێیەکی زۆر لەنێوان کۆمپانیاکاندا هەن . زۆریان بەشێوەیی وا درووست دەکەن کەسەرنجی خەڵکی ڕابکێشێ و بیکڕێ زۆریشیان نرخەکانیان زۆر دابەزاندوە تارەواجی باش بێت .چەندین جۆر لەو فلاش میمۆریانە دەخەینەڕوو کەباشترینیانە بەڵام ئێمە زیاتر جۆری (١) گیگابایتە کەبەباشی دەزانین .

کۆمپانیاکان لە کێبەڕکێیەکی بەردەوام دان، هەوڵ دەدەن فراوانی ئەم فلاش میمۆریانە زیاتر بکەن و بیگەینە(٤) گیگابایت نرخەکانیشیان لە دابەزینێکی بەردەوام دایە.






# چۆنیەتی ڕێگەگرتن لە پیشاندانی فایل و فۆڵدەرە شاراوەکان

ئا: زانکۆ ئەسعەد تەها
zanco-computer@hotmail.com




وێنەی ژمارە (١)

زۆرجار وا پێوست دەکات هەستین بەشاردنەوەی ئەو فایل و دیکۆمێنتە گرنگانەی کە لە کۆمپیوتەرەکەمان دا هەیە بۆ ئەوەی دووربن لە مەترسی سڕینەوە یاخود هەر مەبەستێکی تر، شاردنەوە و پیشاندانی فایل و فۆلدەرکان کارێکی ئاسانە کە ئەمانە لەڕێگای (FOLDER OPTION) دەکرێت، بەڵام ئایا چۆن بتوانین وابکەین کە ئەوە فایل و فۆلدەرانەی کە شاردراونەتەوە کەس نەتوانێت بیان بینێت ئەگەر بمانەوێت هیچ کەسی نەتوانێت ئەو فایل و فۆلدەرانەی کە شاردومانەتەوە بیان بینێت ئەوا دەبێت (FOLDER OPTION) بشارینەوە لە ناو کۆنترل پەناڵ وە لە لیستی (TOOLS) دا، بۆ لابردنەی (FOLDER OPTION) ئەم هەنگاوانە دەکەین:




وێنەی ژمارە (٢)

١- کلیک لەسەر (START) دەکەین وەپاشان (RUN) لەناوی دەنووسین (REGEDIT)، بڕوانە وێنەی (١).

٢- کلیک لەسەر بەشی (HKEY_CURRENT_USER) دەکەین وە ئینجا کلیک لەسەر (SOFTWARE) و (MICROSOFT) و (WINDOWS) و (CURRENTVERSION) و (POLICIES) و دواتر (EXPLORER)، بڕوانە وێنەی (٢).

٣- لەلای دەستە ڕاست کلیکی لای ڕاست دەکەین وە کلیک لەسەر (DWORD VALUE) دەکەین،بڕوانە وێنەی (٣).

٤- ناوی کلیلەکە دەنێین (NOFOLDEROPTIONS) دەبێت یەکەم پیتی ووشەکان کەپیتەل بن واتە هەریەک




وێنەی ژمارە (٣)



وێنەی ژمارە (٤)

لە (N.O.P) کەپیتەڵ بن، و بێ بوونی بۆشایی لەنێوان ووشەکان، بڕوانە وێنەی (٤).

٥- دەبڵ کلیکی لەسەر (NOFOLDEROPTIONS)دەکەین نرخەکەی دەکەین (١)،بڕوانە وێنەی (٥).

٦- پاشان کۆمپیوتەرەکەت ڕیستارت بکە، دواتر بڕۆ ناو کۆنترۆل پەناڵ بزانە ئایا (FOLDER OPTION) ماوە!

تێبینی: بۆ پیشاندانەوەی (FOLDER OPTION) لە ناو کۆنترۆل پەناڵ ئەوا هەمان هەنگاوەکانی سەروە دەکەین وە تەنها نرخی کلیلی (NOFOLDEROPTIONS) دەکەین بە (٠).



وێنەی ژمارە (٥)

## کۆمەڵێک سایتی فێرکاری

چەند سایتێکی فێرکاری بەرنامەی فیژوال بیسک.

HTTP://WWW.KHAYMA.COM/LEARNVB

/HTTP://WWW.ABSOFT2000.COM

/HTTP://WWW.VB4ARAB.COM

ئەم سایتە کۆمەڵێک جوانکاری (تأثیرات) جافای تێدایە

HTTP://WWW.GEOCITIES.COM/TFAROUN/TA1.HTM

فێربوونی درووست کردنی سایت بە بەرنامەی وورد-٢٠٠٠

HTTP://WWW.AFIF2000.8M.NET/WEPWORD.HTM

دوو سایتی تایبەت بە بەرنامەی جافا

HTTP://WWW.ANFYTEAM.COM/LN/ARABIC/INDEX.HTML

HTTP://WWW.GEOCITIES.COM/ABDULLAHJAVA

سایتێکی تایبەت بە فێرکردنی نهێنیەکانی سیستەمی ویندوز ٩٨

HTTP://BBCBBC.8K.COM/ASRAR.HTM

سایتێکی فێرکاری گشتیی

/HTTP://WWW.C4ARAB.COM

سایتێکی تایبەت بە فێربوونی پرۆگرامسازی و بەرنامە دروست کردن

/HTTP://WWW.ARABTEAM2000.COM

دوو سایتی تایبەت بە فێرکردنی نەخشە کێشانی سایتێکی ئەنتەرنێت بە بەرنامەی فرۆنت پەیج ٢٠٠٠

/HTTP://WWW.ALBELADI.COM

/HTTP://LEARNING.8M.COM

سایتێکی تایبەت بە فێرکردنی بەرنامەی ماکس MAX

/HTTP://WWW.NOUFA.NET

دوو سایتی تایبەت بە فێرکردنی زمانی C

HTTP://WWW.KHAYMA.COM/ARABICCPP

HTTP://WWW.C4ARAB.COM/PROGRAMING/C.HTML

# بەکتریاو پاتری مۆبایل




**ئا: شەنگە**

لەگەڵ ئەم پێشکەوتنە خێرایەی بوارەکانی تەکنەلۆژیاو زانستە فیزیایی و کیمیاویەکان بەهەمان شێوەش زانستی زیندەوەر زانی پێشکەوتنی بەخۆوە بینیوە دواتریش تێکەڵبونی ئەم زانستانە لەگەڵ یەکتری زۆرجار ئەقلی مرۆڤ ئەگەینێتە سنوری سەرسوڕمانیەوە، کاتێک دەتەوێ قسە لەسەر بەکتریا بکەین یەکسەر بۆچونمان بۆ لای نەخۆشبون و توشبونە بە مەترسیەکانی ئەم بەکتریایە هەموشمان ئومێدی پارێزگاری و توشنەبونمان بە بەکتریا دەخوازین، ئەمەش هۆیەکەی دەگەڕێتەوە بۆ پەیوەندی بەکتریاو نەخۆشیە درم و ترسناکەکان . بەڵام ئێمە زانیەریەکی کەمان لەسەر ئەو بەکتریایانە هەیە کەسودیان هەیە بۆ ئێمە، لەم پێو دانگەدا زانەیەکی هیندو زانایەکی ئەمریکی هەڵساون بە گۆڕینی بەکتریایەکی ترسناک و زیان بەخش بۆ بەکتریایەکی سودمەند کەدەتوانێت شەکر یان هەر مادەیەکی تری کاربۆهیدراتی هەزم بکات و بیخوات بۆ ئەوەی کارەبامان بە هۆیەوە دەست کەوێت .

ئەوەی مایەی سەرسورمانە ئەم دوو زانایە توانیان پاتریەکی بەکتیری دروست بکەن و چالاک و چوست لە کارکردندا وەدەتوانێت کار بە مۆبایلە کە بکات بۆ ماوەی (٢٥) ڕۆژ بێ ئەوەی بارگاوی بکرێت لەهەمان کاتدا هەرزان لە کڕیندا، بنچینەی چیرۆکەکە دەگەڕێتەوە بۆ (سویدس تشوندری ) بەڕەگەز هیندی و، (دیریک لافلی ) ئەمریکی کاردەکەن بۆ وەزارەتی بەرگری ئەمریکی، ئەو بەکتریایەی بەکاری دێنن لە ناو زەویدا دەژیت و ناوی (رۆدۆفیراکس فیردۆ سینز) کە سەرچاوەیەکی وزەیە. بنتاغۆن دەڵێ هۆی گرنگی دانی ئێمە بەم تەکنەلۆژیایە بۆ درێژکردنەوەی کاتی کارکردنی مایکرۆفۆنەکانە لەناو ئاودا وە بۆ ئامێرەکانی ئاراستە کردنی کەشتیە جەنگیەکان و بۆ ژێردەریایەکان و بەکارهێنانی وەکو سەرچاوەیەکی وزە، چونکە ئەوەی زۆر گرنگە ئەم بەکتریایە مادە شەکریەکان دەخوات و تەزویەکی کارەبایمان پێدەبەخشێت.

لە ڕاستیدا مەسەلەکە تەنها دەست کەوتنی ووزەی مایکربایلۆژیە و هیچی تر دوای ئەوەی چەندان دیراسەی تری لەسەر کراون گەیشتونەتە ئەوەی کەزیاتر لە ٨٣٪ ئەو شەکرانەی کە دەیخوات بگۆرێت بۆ ووزە ئەمەلەکاتێکدا ماددە کیمیاویەکان توانای ٥٠٪ گۆرینیان هەیە بۆ ووزە . لەهەمان کاتدا مەترسیەکانی پیسبونی ژینگەش لەسەر بەکارهێنانی مادە کیمیاویەکان کەمدەکاتەوە، وە هەر شەکرێک بەکار بێت ئەنجامی باشی هەبووە وەک گلوکۆز لە میوەکاندا هەیە، وە فرکتۆزو سوکرۆز لە قامیشی شەکرو چەوندەری شەکر وە دەتوانرێ مادە سلیلۆزەکانیش بەکار بێت کە لە توێکل و پاشماوەکانی دارو تەختە دەمێنێتەوە، ئەوەی شایەنی باسە ئێستا ئەم دوو زانایە لە کۆتایی چارەسەرکردنی کێشە هەندەسیەکانی ئەم پاتریەن و دەیانەوە بەزویی سەرکەوتنی رابگەیەنن، (لافلی) ئەوەی دوپات کردەوە کە کوپەک یان فنجانێک لەشەکر بەسە بۆ کارکردنی ١٧ سەعات پێدانی تەزویەکی کارەبایی ٦٠ واتی، ئەوەی ئاسۆکەی روونتر کردوە بریتە لە گونجانی ئەم بەکتریایە لە هەمو بارودۆخەکانی هەوا لە نێوان (٤ – ٣٠) م دەتوانێت بژیت . لافلی ڕونی کردەوە کە لەداهاتودا پەرەی زیاتر پێدەدەین و وادەکەین لە شوێنە دورەکان بە بێ بەکارهێنانی هیچ سەرچاوەیەکی کارەبایی کارەبامان دەست کەوێت بتوانین هەم ژینگە بەپاکی ڕابگرین هەم بتوانیین بە دەسکەوتێکی کەم بگەین ئەم ووزەیە .

# دروستکردنی فایلی زیپ بەبێ بونی بەرنامەی زیپ

ئا: زامدار عەبدولقادر



وێنەی ژمارە (١)

بەرنامەی WIN ZIP یەکێکە لە خێزانەکانی بەرنامە پەستێنەرەکان و فەرمانی سەرەکیان بریتیە لە بچوککردنەوەی فایلە قەبارە گەورەکان بەهۆی پەستان خستنە سەری، ئەم بەرنامەیە یەکێک لە تایبەتمەندیە باشەکانی بریتیە لە گەڕاندنەوەی فایلەکە بۆ باری خۆی بێ ئەوەی هیچ گۆرانێک لە فایلەکە ڕوبدات یان تێک بچێت دابەزاندنی ئەم بەرنامەیە بۆ ناو کۆمپیوتەرەکەت زۆر گرنگە چونکە لەم سەردەمەدا کە خێرایی بڵاوکردنەوەی زانیارەکانەو بە کەمترین نرخی تێچو وەزۆرترین بابەت و زانیاریە کەسانێکی زۆر بابەت فایلەکان بەم ڕێگایە بڵاودەکەنەوە، ئەم بەرنامەیە دەتوانێت هەموو ئەو فایلانە بکاتەوەو شیان بکاتەوە بۆ باری خۆی و لە هەمان کاتدا بچوکیشیان بکاتەوە لەسەردەمی ئێستای ئەنتەر نێتدا ئەم بەرنامانە زۆر بایەخیان پێدەدرێت چونکە دەبنە هۆی بچوککردنەوەی ڕوبەری داگیرکراو لە ماڵپەرەکانی ئەنتەرنێتدا لە هەمان کاتدا ئاسانی و خێرایی بەکارهێنانی ئەم بەرنامەیە ئەتوانێت قەبارەی فایلەکان زۆر بچوک بکاتەوە تەنانەت دەتوانرێت فایلە دەنگی وێنەیی جوڵاوو نەجوڵاو بچوک بکاتەوە لە ڕوی قەبارەوە بەبێ ئەوەی کاریگەری هەبێت لەسەر دیقەی فایلەکان، لەهەمان کاتدا ئەتوانرێت فایلەکانی پی دی ئێف بکاتە زیپ و بیان پەستێت ئەمەش گۆرانێکی گەورەبوو چونکە لە بڵاوکردنەوەی کتێب و ئەو بابەتانەی کەوا قەبارەیان گەورەبوو دوجار بچوک بکرێنەوە . لێرەدا لە حالەتێکدا ئەگەر کارت بە بچوکردنەوەی فایلەکان هەبوو ئەم بەرنامەیەش نەبوو بەتایبەتی کاتێک بابەتێکی زۆر لە ڕێگای ئەنتەرنێت دەردەهێنیت قەبارەی فلۆپیەکە نایگرێت ئەوا دەتوانین تا ڕادەیەک چارەسەری بکەین بەم شێوەی خوارەوە :

ئاسانترین ڕێگا بۆ ئەم کارە ئەوەیە کە تۆ کلیکی ڕاست بکەیت لە سەر( دیسک تۆپ یاخود لە درایڤی دی یاخود درایڤی سی یان لەهەر فۆلدەرێک کەتۆ حەز بکەیت ئەم فۆلدەرەی زیپی لێدابنێیت ...هتد) یان لە لیستی فایل لەسەر هەر فۆلدەرێک دەتوانیت هەمان کردار هەڵبژێرین و بچیتە سەر NEW لەوێش کلیک لەسەر (COMPRESSED (ZIPPED) FOLDER) بکەیت وەک لەوێنە (١) دا دیارە، ئینجا ئەو فۆڵدەرەی یاخود ئەو فایلەی کە ئامادەت کردوە بۆ ئەوە قەبارەی بچوک بکەیتەوە ئەیخەیتە ناو فۆڵدەرەکە . بۆزیاتر ڕونکردنەوە بڕوانە وێنەی ژمارە (٢) . پاش دروستکردنی فۆلدەرەکە هەموو ئەو فایلانەی مەبەستمانە ئەیخەینە ناو فۆلدەرەکەوە بەمەش ڕاستەوخۆ قەبارەکەی بچووک دەبێتەوەو فایلێکی زیپمان بۆ دروست دەبێت بە قەبارەیەکی کەم...



وێنەی ژمارە (٢)




وێنەی (١)

ئێمە لەوانەی پێشوو باسمان لە بەرنامەی ساوند فۆرج کردبوو (SOUND FORGE) کەوا چەند کارێکی گرنگ ئەنجام دەدات لەبواری دەنگ لەوانە جیاکردنەوەی دەنگ لەدەنگ ورەنگ و لادانی هەوا لەدەنگ و خاوێن کردنەوی دەنگ بەشێوەیەکی زۆرخاوێن و هەروەها تێکەڵکردنی دوو سێ دەنگ بەشێوەیەکی سەرکەوتوو. ئەم بەرنامەیە زۆرشتی ترئەنجام دەدات بەپشتیوانی خوا لەوانەکانی تر بەزنجیرە باسیان دەکەین لەم وانەیە باسی چۆنیەتی جیاکردنەوەی مۆسیقا لەگۆرانی دەکەین.

چۆنیەتی کارکردن ..

سەرەتا ئەو گۆرانیەی پێویستمانە OPEN دەکەین لەناو بەرنامەکە پاشان ئەوشوێنەی پێویستمانە لەگۆرانیەکە بەماوس دیاری دەکەین وەک وێنەی ژمارە (١) ئنجا دێینە نووسینەکانی سەرەوە PROCESS دادەگرین بەماوس لەوێشەوە CHANNEL CONVERTER هەڵدەبژێرین وەک وێنەی ژمارە (٢) ئەم لیستە دەکەوێتە بەرچاومان دەتوانین لەرێگای PREVEWE گوێمان لەکارەکان بێت پێش ئەوەی OK بکەین ئنجا OK دەکەین وەک وێنەی ژمارە (٣).



وێنەی (٢)



وێنەی (٣)

# ناساندنی پارچەکانی کۆمپیوتەر بە ئامێرەکانەوە

ئا: شێرزاد ڕەئوف




وێنەی ژمارە (١)

کاتێک دەتەوێت ئامێری چاپ (پرینتەر) بە کۆمپیوتەر بناسێنیت یان سکانەر یان هەر پارچەیەکی تری کۆمپیوتەر بێت یان بەشێکی تری کۆمپیوتەر بناسێنین وەکو تەعریفی شاشەو دەنگ و مەلتی میدیاو فلاش میمۆری و هەر شتێکی تر بێت پێویستی بە کۆمەڵێک هەنگاو هەیە، زانینی ئەم کارە لە ناو کۆمپیوتەر زۆر گرنگە چونکە جاری وا هەیە لە کاتە گرنگەکان ئەم پارچانە یان بەشانە بە کۆمپیوتەرەکەتەوە بناسێنیت تاکو نەبێتە بەربەست بۆ کارکردن و ئەنجامدانی کارەکان بۆ نمونە ناتوانیت کار لە بەرنامەیەکی دەنگی بکەیت ئەگەر تەعریفی دەنگت نەبێت ناتوانیت زانیاریەکان بخەیتە ناو فلاش میمۆریەوە




وێنەی ژمارە (٢)

ئەگەر تەعریف نەکرابێت . بۆ ئەم مەبەستە بە ئاسانترین شێوە فێری ناساندن ببیت تاکو بتوانیت بەسەر ئەم چەڵەمەیە زاڵ بیت جا لێرەدا دێین بەگشتی باس لە چۆنیەتی ناساندن دەکەین لە کۆمپیوتەر لە سیستەمی ویندۆزی XP وە بۆ زانیاریتان ئەم هەنگاوانە لە زۆربەی سیستەمەکانی ویندۆزدا وەک یەکە وە هیچ جیاوازیەکی ئەوتۆی نیە .

لە سەرەتادا سیدی تایبەتی ئەو پارچەی تەعریفی دەکەین ئەیخەینە ناو سیدی رۆمەوە دواتر دەچینە کۆنترۆ پەنەلەوە ( CONTROL PANEL) لەوێ وەک لەوێنەی ژمارە (١) رونە (ADD HARD WARE) هەڵدەبژێرین دوو کلیکی لە سەر دەکەین دواتر چوارگۆشەیەک دەکرێتەوە یەکسەر کلیک لەسەر NEXT بکە بروانە وێنەی ژمارە (٢) چاوەروان بە تا گەرانێک بە ناو کۆمپیوتەرەکەدا دەکات دواتر داوات لێدەکات کە ئایا مەبەستە شتێک بە کۆمپیوتەرەکە بناسێنیت بۆیە فەرمانی یەکەم کە (YES) هەڵدەبژێرین دواتر کلیک لەسەر NEXT دەکەین بروانە وێنەی ژمارە (٣) یان پارچەی مەبەست پێناسە بکەین دەست نیشانی بکەیت .وەک لە وێنەی ژمارە (٤) دەردەکەوێت دەتوانین ئەو بەشە یان پارچەیە دەست نیشان بکەین کە مەبەستمانە بە کۆمپیوتەری بناسێنین دواتر کلیک لەسەر NEXT بکە بە دوایدا کلیک لە سەر FINISH بکە وەک لە وێنەی ژمارە (٥) رونکراوەتەوە ئنجا جاری وا هەیە ئەیدۆزیتەوە جاری واهەیە داوات لێدەکات کە بەخۆت لەناو سیدیەکە بگەرێیت بۆ دۆزینەوەی ئەم کردارەشیان زۆر ئاسانە یەکسەر دەست دەکەیت بە کردنەوەی ئەو فۆڵدەرانەی تایبەتن بەم بەرنامەو ناساندنە بۆ نمونە کاتێک دەتەوێ تەعریفی دەنگ بکەیت دەچیتە سەر فۆڵدەرەکانی دەنگ وە بەم شێوە دەتوانیت هەموو کردارەکانی ناساندن بە جێ بگەیەنیت ..



وێنەی ژمارە (٣)



وێنەی ژمارە (٤)



وێنەی ژمارە (٥)

# چۆنێتی دروست کردنی ئارمێک


وێنەی (١)

ئا: سامان کۆیی

بەرنامەی ( KEIK 2000) بەرنامەیەکە تایبەتە بەدروست کردنی ئارم و مۆرو نوسینی جوانکاری بۆ ئەوکەسانەی کەئارەزوویان لەم بوارەدا هەیە ئەم بەرنامەیە زۆر بەئاسانی ئەم کارەمان بۆدەکات.

لەسەرەتاوە دەچینە سەر LINE PROPERTIES ئەم هێمایە دەر دەچێت لەبۆشاییەکە ناوی کوردستان دەنوسین وەک وێنەی (٤)

لەم وێنەیەدا کە نوسینەکە دەنوسین و ناونیشانی (COLOR) بۆ ڕەنگ کردنی نوسینەکەیە وە (SIZE) بۆ گەورەکرن و بچووک کردنەوەی نوسینەکە وە (STYLE) بۆ شێوازی نووسینەکەیە.

پاشان (APPLY) دادەگرین ئنجا (CLOSE) دادەگرین دەبینین


وێنەی (٢)


وێنەی (٣)



وێنەی (٤)



وێنەی (٥)

ناوکە لەسەر ڕووبەرەکە دروست بووە وەک وێنەی (٥).
لەلای دەستە چەپەوە دەبینین کە چەند هێمایەک هەیە هەریەکە کارێک دەکات هێمای بۆ جولاندنەوە گواستنەوە لەشوێنێک بۆ شوێنێکی تروە هێمای دەستەکە بۆ گرتنی نووسینەکەیە وەلەگەل ڕووبەرەکە بەکاردێت وە هێمای سوراوەکە بۆ سوراندنی پیتەکان بەئارەزوی خۆمان وەک وێنەی (٦).
هێماکانی تر کە لەوێنەکەدا دیارە بۆ چەند ئامرازێک بەکاردێت وەک لکاندن و ودرێژکرنەوەی پیتەکان پاش ئەوەی بەئارەزووی خۆمان ئارمێکمان کرد بە ویستی ئێمە بوو، دەچینە سەر (FILE) بۆخەزن کردنی (SAVE AS ) کلیک دەکەین و چ جۆرە وێنەیەکمان دەوێت بەو جۆرە خەزنی دەکەین وەک وێنەی (٧).

**تێبینی: ئەم بەرنامەیە تەنها بۆ نووسینی کوردی و عەرەبی بەکاردێت.**


وێنەی (٦)


وێنەی (٧)